## ناسنامەی کتێب

❖ ناوی پەرتوك: بەرەو هۆشیاری هزری مرۆڤی موسلمان
❖ دانەر: ئاشتی ستار محمد شێخانی ( ٠٧٥٠٤٣٠٢٧٧٦ )
❖ تایپ: نوسەر
❖ دیزاین و هەڵەچن: ڕێبین شاعیر
❖ نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٤/٨/١٠
❖ تیراژ: ٥٠٠ دانە
❖ چاپ: چاپخانەی منارە – هەولێر ( ٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧ )
❖ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ٣٩٥ )ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

# پێشەکی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سەلام و ڕەحمەتی خوا بڕژێتە سەر گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی محمد(درودی خوای لێبێت)، وە یارویاوەرانی بەگشتی.

بیرمەندان بۆچوونیان وایە کە لە مێژوودا هەر وڵاتێك بیرمەنـد و فەیلەسـوفی تێدا نەبوو بێت زۆر بەئاسانی لەلایەن دوژمنانەوە داگیر کراوە، هـەر وڵاتێکـیش خاوەنی فەیلەسوف و بیرمەند و کەسی عاقڵ و ژیر بـوو بێـت داگـیر نـەکراوە، چونکە ئەو بیرمەندانە کاریگەری ئەوتۆیان هەبووە بەسەر کۆمەڵگاکەو خـاوەنی وەعی و هۆشیاری و ژیری بوونەو توانیویانە جیاوازی لـە نێوان خراپ و چـاکدا بکەن و ئاراستەی کۆمەڵگا بەرەو کەناری ئارامی و کامەرانی بکەن.

خوێنـەری بـەڕێز لـەو پەرتوکـەدا چـاوت دەکـەوێ بـە کۆمـەڵێك بابـەتی هەڵبژێردراو بەناو نیشانی جیاجیاو دواجار هـەموویان لـە ژێـر یـەك ناونیشـانی سەرەکی کۆکراونەتەوە کە بریتیە لە: (بەرەو هۆشیاری هزری مرۆڤی موسڵمان)، ناوەڕۆکی ئەو پەرتوکە دابەش بووە بەسـەر دوازدە تـەوەری سـەرەکی، کـە بـە "پێناسەی هزر" دەست پێدەکات و بە "ئیختیلاف سونەتی ژیانە" کۆتایی پێـدێت. هەریەك لەو بابەتانـە لـە کـات و بۆنـەو واقیعـی جیاجیـا نوسـراون، سـود لـە خوێندنەوەو سەرچاوەی جۆراو جۆر وەرگیراوە و لە بەشێك لە ڕۆژنامەو گۆڤار و سایتەکان بڵاو کراونەتـەوە، وەکـو گۆڤـاری: چـرای ڕونـاکی، ژیـر، دوانگـە، ستاندەر، حیوار و... هتد. دوای پێداچونەوەو زیاد و کەم کردنی جارێکی تر لە دووتوێی ئەو پەرتوکە دەیانخەینەوە بەر دیدی ئێوەی بەڕێز، داوای لێبوردن دەکەین

ئەگەر کەموکورِیەك هەبێ هەستمان پێ نەکردبێ، یان هەر هەڵەیەکی هونەری تر، چونکە ئەوە توێژینەوە نیە تا بە فلتەر و مەرج و چوارچێوەکانی توێژینەوەدا تێپەرِ بووبێ، بەڵکو زنجیرە بابەتێکە لە چوارچێوەی خوێندنەوەی زۆر و تۆمار کردنی زانیاری لێرەو لەوێ و دارِشتنی فیکرەو بۆچوون و کۆمێنت و بیرکردنەوەو خوێندنەوەی کتێبی بیرمەندان و وتار و بابەتی هەمەجۆر هاتۆتە بەرهەم. ئومێدەکەم جێگای رەزامەندی خواو ئێوەی بەرِێز بێت.

نوسەر

٢٠١٤/٨/٥

# تەوەری یەکەم
# پێناسەی هزر

زانایان لە بارەی هزرەوە بۆچوونی زۆریان هەیە و من نامەوێ ئاماژە بەو هەموو تێڕوانینە بدەم، بەڵکو پێناسەیەکی کورت و پوخت بۆ فیکر و هزر دەکەین، بەبۆچوونی من پێناسەی شێخ محمد ڕەزا تا ڕادەیەك گونجاوە کە دەڵێ: هزر بریتیە لە جوڵەی عەقڵ و بەکارهێنانی ژیری و توانای مرۆڤ لە نێوان زانین و نەزانیدا.

باشتر لەو پێناسەیە ئەو وەسفەیە کە دکتۆر طارق سویدان لە یەکێك لە بەرنامەکانی بۆ فیکر دەیکات و دەڵێ:(الفكر: هو إعمال العقل في أمر ما للوصول لرأي جديد فيه). واتە هزر بریتیە لە بەکارهێنانی عەقڵ و ژیری لە هەر بابەتێك، بەمەبەستی گەیشتن بە بۆچوونێکی نوێ، ئینجا ئەگەر ئەو بابەتە ڕامیاری بوو، ئەوە فیکرەکەمان فیکرێکی ڕامیاریە، ئەگەر ئابوری بوو، فیکرەکەمان فیکرێکی ئابوریە، ئەگەر شارستانی بوو، فیکرەکەمان فیکرێکی شارستانیەو...هتد. لەڕاستیدا ئەوە پێناسەیەکی جوان و گونجاوە.

لە بارەی هزری ئیسلامیشەوە دکتۆر موحسین عبدالحمید وەکو بیرمەندێکی ئیسلامی بەو شێوەیە وەسفی هزری ئیسلامی دەکات و دەڵێت: دەرەنجام و بەرهەمی هزری موسڵمانەکانە لە هاتنی پێغەمبەرەوە(درودی خوای لێبێت) تاوەکو ئەوڕۆ، لە هەموو زانست و زانینە کەونی و گەردوونیەکانی پەیوەندیدار بە خواو جیهان و مرۆڤ، هەروەها ئەوەی لە ئەنجامی عەقڵ و ژیری و دانایی مرۆڤەکان دێتە

کایەوە لە تەفسیر و ڕوونکردنەوەی ئەو زانستە گشتیە گەردوونیە لە چوارچێوەی ئامانج و بیروباوەڕ و شەریعەت و ڕەفتاری ئیسلامی.

ئەوەی جێی تێبینیە ئەوەیە هەر دەرەنجامێکی هزری مرۆڤ کە سەربەخۆیانە دێتە بەرهەم و لە ئیسلام[1] و دەقە نەگۆڕەکانەوە سەرچاوە ناگرێت، ناکرێ بە هزری ئیسلامی پێناسەو ناوزەند بکرێت، ئەوە لۆژیکێکی ڕاست و دروست نیە پێناسەی هزرێك کە ئیسلامی نیە بەئیسلامی بکەیت و لە سەر ئیسلام هەژماری بکەیت، بەڵکو هزروبیرکردنەوەیەکی گشتیە ڕەنگە جار و بار لزیك بێت لە ئیسلام و هەندێك جاریش دوور. کەواتە ئەو هزرە دەدرێتە پاڵ ئیسلام کە لە چوارچێوەو باگراوەندی ئاینی ئیسلامەوە هەڵدەقوڵێت.

بەبۆچوونی هەندێك لە زانایانی هاوچەرخ دروست نیە بگوترێ هزری ئیسلامی، چونکە ناکرێ ئیسلام دابەشی سەر کۆمەڵە هزرێك بکرێت، پێیان وایە ئەوەش هەوڵێکی سەرکەوتووی تری دوژمنانی ئیسلامە کە توانیویانە لەو ڕێگەیەوە دزە بکەن و کێشە بۆ موسڵمانان دروست بکەن، بۆیە ئاماژە بەوە دەکەن کە هەندێك لە بیرمەندانی ئیسلامی هەستیان بەو مەترسیە کردووە، بۆ نمونە سەید قوتب، کە لە چەند ناونیشانێکدا لە بری هزری ئیسلامی(الفكر الاسلامي)و تێڕوانی ئیسلامی(التصور الاسلامي) یاخود تایبەتمەندیەکانی تێڕوانی ئیسلامی(خصائص التصور الاسلامي) یان (مقومات التصور الاسلامي) بەکار دەهێنێت.

---

(١) مەبەست(قورئان و سونەتە).

کورتەی بابەتەکە ئەوەیە، کاتێك دەڵێین هزری ئیسلامی مەبەستمان خودی ئیسلام نیە بەو شێوەی کە نیگای خوایەو جێگیر بووە لە دوو سەرچاوەی پارێزراو. کەواتە ئەو هزری ئیسلامیە پارێزراو نیە وەکو خودی ئاینی ئیسلام. بۆیە پێویستە تێکەڵ بەیەکدی نەکرێن، دواجار تێکەڵ کردنیان دەبێتە مایەی تێکەڵ بوونی هزری مرۆڤ و نیگای خوا(الوحي)، ئیتر کارەساتی لێدەکەوێتەوە، بەو شێوەیە هزری ئیسلامی ملکەچە بۆ ڕاست و هەڵە.

کەسی عاقڵ و ژیر ئەگەر بە وردی لە مێژووی ئیسلامیدا ورد ببێتەوە، دەبینێ کە زۆر هزر و بۆچوون هەیە بۆ لێکدانەوەو ڕونکردنەوەی ئیسلام خراونەتە ڕوو، بەڵام ئەوڕۆ بووە بە خودی ئیسلام، هەمان قەداسەت و پیرۆزی ئیسلامی وەرگرتووە، دواجار ئەوە بووە بە کۆسپ و ئاستەنگی گەورە لە بەردەم موسڵمانان و گەشەکردنی شارستانیەتی ئیسلامی، چونکە ئەوە یەکێکە لە مەترسیدار ترین ئەو شتانەی کە بیروبۆچوون و لێکدانەوەی هزری مرۆڤن و بۆ لێکدانەوەی لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان هاتوونەتە بەرهەم، بەڵام دواتر ئەو بۆچوونانە بوونەتە ئاینێکی پیرۆز و کارەسات لەوەش گەورە تر ئەوەیە کە لێپێچینەوەی مرۆڤەکانیان لە سەر دەکرێت.

بۆیە لە سەر هەر توێژەرێکی بواری ئیسلامی پێویستە ڕادەی جیاکەرەوە یان سنورێك هەبێت لە نێوان بۆچوونی خۆی و بۆچوونی ئیسلام، هەروەها پێویستە هزری مرۆڤ لە چوارچێوەی بەرنامەی خوادا پێوانە بکرێت، چونکە خوای گەورە قورئانی وەکو بەرنامەو مەنهەج بۆ عەقڵی مرۆڤەکان دابەزاندوە، عەقڵی مرۆڤیش

دروست کراوە وەکو ئامرازێکی سنوردار بۆ لێکدانەوەو شیکردنەوەو گەیانـدنی ئەو مەنهەج و بەرنامەیەو دواجار خزمەت کردنی ئەو قورئانە بە باشترین شێوە.

ئیسـلام قەدەغـەی دەربـڕینی بۆچـوون و هەوڵـدان و کـۆمێنتی مرۆڤـەکانی نەکردوە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە تێکەڵ بە خودی ئیسلام نەکرێت، چـونکە وەکو ئاماژەمان پێدا لـە حاڵەتی تێکەڵ بوونیدا بۆچوون و هـزری مـرۆڤ پـیرۆزی وەردەگرێ، لـەو ڕۆژگارەدا ئەوە زۆر بە ڕوونی بەدی دەکرێت، کاتێك یـەکێك بیرکردنەوەیەکی خۆی دەردەبڕێ و بۆچوونی خۆی دەخاتە ڕوو، وا دەزانـێ کـە ڕاستی ڕەها لای ئەوەو ئەوانی تر هەمووی هەڵەن.

لـە جەنگی بەدر موسڵمانەکان دابەزینە سەر ئاوەکە کە شـوێنێکی نـزم بـوو، ئەوەش بۆ جەنگ مەترسیدارە شوێنت نزم بێت، حوبـابی کـوڕی مـونزیر(ڕەزای خوای لێبێت)گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شوێنەت بینیوە؟ ئایا ئەو شوێنە خـوا بۆی دیاری کردووی و ئێمە ناتوانین نەپێشی کەوین و نە لێی پاشکەوین؟ یـاخود ئـەوە بۆچـوونەو جـەنگیش فـرت و فێڵـە؟ پێغەمبـەر (درودی خـوای لێبێـت) فەرمووی:((بل هو الرأي والحرب والمكيـدة))، حوبـاب گـوتی دەی باشـە ئـەوە شوێنێکی گونجاو نیەو تا دوایـی ڕووداوەکـە. مەبەسـت ئەوەیـە هـاوەڵان چـەند جەختیان کردۆتەوە لـەوەی ئایا ئەوە نیگای خوایە یان بۆچوونی کەسێتیە، چونکە ئەگەر نیگا(الوحي) بێت مافی ئەوەیان نیە قسـەی تێـدا بکـەن و بۆچـوونەکانیان تێکەڵی پەیامی ئاسمانی بکەن، بەڵکو دەبێ پابەند بـن پێـوەی، هـەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ

**﴿هُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ﴾[٢]، واتە بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە بەڕاستی بەئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە.**

**ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین دەبینین مەجالی فیکر و هزر و پرۆسەی بیرکردنەوە مەودایەکی زۆری وەرگرتووە بەئامانجی ئەوەی هانی مرۆڤەکان بدات بۆ ڕامان و بیرکردنەوەو ڕوانین لەو گەردوونە بەرفراوانە.**

فەرهەنگی زاراوە فیکریەکان لە قورئاندا



| التفکر | التدبر | العقل | الالباب | النهی |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ جار | ٤ جار | ٤٩ جار | ١٦ جار | ٢ جار |

**لە کۆتاییدا "میلتون" شاعیری ناوداری ئینگلیزی لەبارەی هزرەوە، دەڵێ: (إن عقل الإنسان في مكانه يستطيع أن يجعل الجنة نار والنار جنة)، واتە عەقڵی مرۆڤ لە شوێنی خۆیەوە دەتوانێ بەهەشت بکاتە دۆزەخ و دۆزەخیش بکاتە بەهەشت. ئەو زیاتر مەبەستی ئەوەیە کە بیرکردنەوەی مرۆڤەکان بڕیار لە سەر چۆنیەتی ژیانیان**

---

(٢) الاحزاب: ٣٦.

دەدات، چونکە ژیانی مرۆڤ دەرەنجامی بیرکردنەوەکانیەتی. بۆیە دۆڕاوەکان هەمیشە بیر لە دەرباز بوون دەکەنەوە لەو تەنگو چەڵەمەی تێی کەوتوون. لەولاشەوە خەڵکی ئاسایی بۆ مانەوەو گوزەراندنی ژیانێکی سادە بیر دەکەنەوە. بەڵام سەرکەوتووەکان بەردەوام بۆ پێشکەوتن و بردنەوە بیر دەکەنەوەو هەمیشە وێنای داهاتوو دەکێشن بۆ ئەوەی بگەن بە ئامانج و خەونەکانیان.

# تەوەری دووەم
# عەقڵی موسڵمان لە قەیراندایە

لە ڕۆژگاری ئەوڕۆماندا زۆر بە ڕوونی هەست بە قەیرانێکی گەورە دەکرێ کە تووشی عەقڵی تاکی موسڵمان هاتوەو وەکو ڤایرۆسێك سەرتاپای ئومەتی گرتۆتەوەو لە پەل و پۆی خستوەو بێ تواناو لاواز و بێ ئیرادە و دەرامەتی کردووە، عەقڵی موسڵمان تووشی کۆمەڵێك نەخۆشی کوشندەو مەترسیدار بۆتەوەو زیاتر لە چوار سەدەیە پێوەی دەناڵێنێ و تووشی دواکەوتوویی کردووە، بەڵام ئەو نەخۆشیانەی تووشی عەقڵی موسڵمان هاتوون جیاوازن لە گەڵ نەخۆشیە جەستەییەکان و گوناهی مرۆڤەکانی پێ هەڵناوەرێت، بەڵکو پێی گوناهبار دەبێت، لێرەوە ئاماژە بە هەندێك لەو نەخۆشیانە دەکەم کە قەیرانێکی گەورەیان بۆ عەقڵی مرۆڤی موسڵمان دروست کردووەو دواجار بوونەتە بەربەست لەبەردەم بەرەو پێشچوونی ئاینی ئیسلام:

یەکەم: نەخۆشی تەقلید و چاولێکەری: ئەوە مەترسیەکی کوشندەی هەیە لە سەر عەقڵی مرۆڤەکان بەتایبەت موسڵمانەکان، ئەو ڤایرۆسی تەقلیدە زیاتر لەڕیزی خەڵکە عەوامەکە بڵاو دەبێتەوەو کاریگەری نەرێنی دەبێت. بەتایبەت لەو کاتەی زانایان و ئەو کەسانەی کە خۆیان بە پێشەوای خەڵك دەزانن لەو نەخۆشیە تێوەدەگلێن، لە ڕاستیدا جێی سەرسوڕمانە کە دەبینین کۆمەڵێکی زۆر لە چینی ڕۆشنبیر و مەلا بەئاستی زانستی جیاجیا گیرۆدەی تەقلید بوونە بەشێوەیەك بەرهەمی فیکریان نیەو ئاماژە بە فیکری کەسێکی چەندسەد ساڵی پێشە خۆیان

دەکەن، لە کاتێکدا وەکو ئەوان مرۆڤن. ئەبوحەنیفە دەفەرموێ:((ما جاءَ عن اللهِ تعالى فعلى الرأسِ والعينين، وما جاءَ عن رسولِ الله صلى اللهُ عليه وسلم فسمعاً وطاعةً، وما جاءَ عن الصحابةِ رضي الله عنهم تخيرنا من أقوالهم، ولم نخرجْ عنهم، وما جاءَ عن التابعين فهُمْ رجالٌ ونحنُ رجالٌ))، واتە ئەوەی لای خواوە هاتووە بەسەر سەر و بەسەر چاو، ئەوەی لای پێغەمبەرەوە هاتووە گوێڕایەڵ و ملکەچین، ئەوەی لای هاوەڵانەوە هاتووە ئەوە لەناو قسەکانیان هەڵدەبژێرین، وە لێیان دەرناچین، ئەوەی لای تابیعینەوە هاتووە ئەوان پیاون ئێمەش پیاوین. ئەوە قسەی پێشەوا "ئەبوحەنیفە نوعمانی کوڕی ثابت" فەقیهی عێراقە، لەکاتێکدا ئەنەسی کوڕی مالیك و عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح و نافیع و عیکرەمەی بینیوەو گوێی لێگرتوون. کەواتە ئێمە یەك مرۆڤین و یەك دروست کراوین، سیفات و خاڵی هاوبەشی وەکو هەستەوەری بیستن و بینین وکۆی ئەندامەکانمان وەکو یەکن. بۆیە دەکرێ سودیان لێ ببینین و شوێنکەوتەیان بین لە دڵسۆزی لە کارکردن و ڕاستگۆیی لە بانگەواز و ئارام گرتن لە کاتی بەڵاو ئێش و ئازار، بەڵام ناکرێ عەقڵی خۆمان ڕابگرین و بەلێکەوتە فیکریەکانی ئەوان کە تایبەت بووە بە واقیعی خۆیان کار بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستمان ئەوەنیە خوانەخواستە وەکو ئەوەی هەندێك کەسی نەفام ڕاست و چەپ دەکەونە قسە گوتن و بێ ڕێزی کردن بەرامبەر ئەو زاناو پێشەوا گەورەو لە خواترسانە، بەڵکو زیاتر دەمانەوێت ڕەچاوی بارودۆخ و واقیع و هەلومەرجی لێك جیاوازی قۆناغەکانی ژیانی ئەوکات و ئێستا بکەین و هیچی تر.

دووەم: پاڵدانەوەو وێڵ کردنی تێفکرین و ڕامان لە قورئان و بیرکردنەوە لە گەردوون و...هتد. ئەوەش دواجار دەبێتە هۆی ڕەت کردنەوەی هەموو شتە

ڕاست و بەڵگەنەویستەکان، لە ئەنجامدا تووشی لایەنگیری و هەڵچوون دەبینەوەو خۆمان دەبەستینەوە بە شتی شاز و ناوازەو سەیر، وە دەبینە سفری پاش فاریزە.

سێیەم: بیرۆکەی پیلانگێڕی: یەکێکی ترە لەو نەخۆشیە مەترسیدارانەی بەشێوەیکی بەرچاو بڵاو بویتەوە لە نێو ڕیزی موسڵمانان، مرۆڤی موسڵمان پیلان بۆ برای موسڵمان دەگێڕێ، پارتی ئیسلامی پیلان بۆ پارتی ئیسلامی دەگێڕێ، بانگخوازی ئیسلامی پلان بۆ پارتی ئیسلامی و بە پێچەوانەوە هەموو ئەوانە بوونەتە دیاردەو بوونیان هەیە، هەروەها غەیبەت و باسکردنی یەکتر و هەوڵدان بۆ سوك كردنی بەرامبەر و...هتد، لەو دیاردە نەخوازراوو نەشازانەیە کە بە ئاینی ئیسلام و عەقڵی کەسایەتی ڕاستەقینەی موسڵمانان ناخوات.

چوارەم: خراپ تێگەیشتن و جێبەجێ کردن و لادان لە دەق و بەرنامەو مەنهەجی خوا، هەلی زیاتری ڕەخساندووە بۆ هاتنە پێشەوەی کاراکتەری وێرانکاری قیەم و بەها ئاینی و ئیسلامیەکان و لە مێژووشدا هەر ئەوە بوو وای کرد شارستانیەتی ئیسلامی لە سەر شانۆی جیهان بێتە خوارەوە.

پێنجەم: داگیر کردنی جیهانی ئیسلامی لە دوای وەفاتی شێخ محمد عبدالوهاب و ئەو کۆسپ و تەگەرانەی پێشیان بە پرۆژەکەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە گرت، وای کرد جیهانی ئیسلامی تووشی جۆرێك لە لێك جیابوونەوەو هەڵوەشانەوە ببێت و هەندێك سەرسام بوون بە شارستانیەتی ئەوروپاو ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی گشتی و بەشەکەی تر کەوتنە دژایەتیەکی ڕەهاو بەربڵاوی ئەو پێشکەوتنەی ئەوروپا، ئەوە لێکترازانێکی مەترسیداری بەدوای خۆیدا هێنا، چونکە نەتواندراوە

جیاوازی لە نێوان باش و خراپدا بکرێت و بەرەیەکیان بەتەواوی پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوایی ڕەد کردەوەو ئەوی تریان باوەشی پێدا کرد و پێی سەرسام بوو.

بەبۆچوونی من قۆناغەکانی ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوەو هێرشەکانی سەر جیهانی ئیسلامی لە چوار قۆناغی سەرەکی پۆلێن دەکرێت:

قۆناغی یەکەم: جەنگی خاچ دروشمەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی و داگیر کردنی و مانەوەیان بۆ ماوەی دەیان و بگرە سەدان ساڵ وە دامەزراندنی چوار میرنشینی خاچ دروشم لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامی و مانەوەیان بۆ ماوەی (٢٠٠) ساڵ لەو ماوەیەدا بەهەموو شێوەیەك لە ئەورووپاوە یارمەتیان بۆ ڕەوانە دەکرا. هەر ئەو جەنگە وای کرد ئەورووپا یەك بگرێت دژی جیهانی ئیسلامی بەناوی ئەوەی گاورەکان لە وڵاتی موسڵمانان ستەمیان لێدەکرێت، هەر ئەوەش کاریگەرییەکی نەرێنی لە سەر دەسەلاتدارانی موسڵمان جێهێشتووەو ئەوەندەی سەرقاڵی پاراستنی گاور و جولەکەکانن، ئەوەندە ئاگایان لە موسڵمانەکان نیە، ئەوەش بۆ ئەوەی ئەورووپاو ڕۆژئاوا لە خۆیان ڕازی بکەن و هیچی تر. لە ڕاستیدا دەبێ هاوسەنگی لەنێوان نەتەوەو پێکهاتە ئاینی و ڕێبازگەرەکان ڕابگیرێ و هەلی لێکتێگەیشتن و پێکەوەژیانی زیاتر برەخسێندرێت، نەك چوار کەس لە کەمایەتییە ئاینییەکان بکوژرێت دونیا خراپ بێت و بەهەزاران موسڵمان لە چرکەیەکدا لەناو بچێت کەس قسەیەك نەکات. مێژوونوسی ئەورووپی "دیورانت" دەڵێ: ئەورووپا بەو شێوەیە یەکی گرت پاش ئەوەی لە مێژوودا یەکیان نەگرتبوو، وە پیاو ژن و منداڵیش بە کۆی گشتیان حەماسەتیان گرتبوو بەشداریان دەکرد لەو جەنگە نەگریسە، تا ئەوەی بە دەستی موسڵمانەکان شکستیان خوارد و دۆڕان و بە سەرکردایەتی

سەرکردەیەکی کورد بەیتول مەقدیس ڕزگار کرا، دواجار کە خاچ دروشم و جولەکەکان دەستیان بەسەر داگرتەوە ئێستاشی لە گەڵ بێت عەرەب نەیانتوانی وەری بگرنەوەو بەرگری لێبکەن، هەروەها ئەو سیستەمە دیکتاتۆریەی هەندێك لە وڵاتانی عەرەبی پێڕەوی دەکەن توانیویانە بەسەر هەموو مزگەوتەکان دادەن و موسڵمانان دەستگیر بکەن و بیان کوژن بەڵام نەیانتوانیوە لە مزگەوتی ئەقسا نزیك ببنەوەو جولەکەیەك ڕاو بنێن. ئەوەی جێی سەرنجە ڕۆژئاواییەکان بۆ خۆیان یەکیان گرتووەو یەك دراو یەك فیزەو یەك سنوریان هەیە، بەڵام هەموو نەتەوەو گەلەکانی تر بەتایبەت موسڵمانەکان بەش بەش و پارچە پارچە دەکەن، بۆ ئەوەی هەمیشەو بەردەوام بەسەریاندا زاڵ بن.

قۆناغی دووەم: داگیر کردنی هزر و فیکری موسڵمانەکان، کە لە ڕێی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە جێبەجێ دەکرا، ئەو قۆناغە جێ گرەوەی هەڵمەت و جەنگی خاچ دروشمەکان بوو، پلانێکی تر بوو دژی جیهانی ئیسلامی، هۆکارەکانی ئەو هەڵمەتە دوو بەشە، بەشێکیان موسڵمانەکان خۆیان بەرپرسیارن لە دروست کردنی ئەوکەش و هەوایەو فرسەتێکیان ڕەخساند بۆ ئەوەی وڵاتە ئەورووپیەکان بتوانن عەقڵ و فیکر و هزر و مێشکی تاکی موسڵمان داگیر و کۆنتڕۆڵ بکەن، بەشی دووەمیش هۆکاری دەرەکی هەبوو.

قۆناغی سێیەم: فێڵ و خۆڵ کردنە چاوی خەڵکەوە، کە مەبەستمان داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلامیە لەلایەن ڕۆژئاواو ئەمریکاوە بەناوی ڕوخاندنی دیکتاتۆر و ستەمکارەکان، لە ژێر عەباکەشیان تەبشیریەکان کاری خۆیان دەکەن و ئینجیل بلاو دەکەنەوەو عەقڵ و بیری مرۆڤەکان تێك دەدەن، هەروەها لە

پەراوێزیانەوە دەیان زانکۆ و رێکخراو و کۆمپانیاو دەزگـای جۆربـەجۆر دیـن و کەلتور و مێژوو زانست و رەسەنایەتی و ســەروەت و ســامانی سروشــتیمان بـۆ خۆیان دەبەن، یاخود لای کەمی دەبنە هاوبەش.

قۆناغی چوارەم: هەڵوەشـاندنەوەو لێکترازانێکـی مەترسـیدار لــە نێـو ریـزی موسڵمانەکان و کەرت کەرت و بەش بەش کردنیـان، بەشـێوەیکی بەرنامـە بـۆ دارێژراو لە رۆژئاواو ئەمریکاوە، وە دروست کردنی گروپ و کۆمەڵی چەکدار بەناوی ئیسلامەوەو سەرقاڵ کردنیان بە یەکتریەوە[٣].

دواجار بابەتی تەکفیر کردنی خەڵك و نەخوێندنەوەی بەرامبەری لێکەوتەوە، بە داخەوە ئەمرۆ یەکێ لەو دیاردانەی لە نێو کۆمەڵگا بەگشتی و هەندێ لە توێژی گەنج و هەرزەکار و چینی رۆشنبیر و بیرمەند و مامۆستای ئاینی بە تایبەتی سەری هەڵداوەو بڵاو بۆتەوە بریتیە لە تەکفیر کردنی خەڵك یان نەخوێندنەوەی بەرامبەر، هەروەها کارکردن لە سەر خاڵە نەرێنی و ناکۆکەکان و وەلانانی خاڵە ئـەرێنی و هاوبەشەکان، ئەوەش لە دەرەنجامی ئیمانێکی لاواز و تێگەیشتنێکی ناتەندروستەوە سەرهەڵدەدات و سەر چاوە دەگرێ، ئەو دیاردەیە زۆر ترسناکە لە سەر کۆمەڵگا بە گشتی، چونکە دەبێتە مایەی ئەوەی سەر لە خەڵکی بشێوێنێ بە جۆرێـك کـە نەزاندرێ بە گوێی کام لاو کام مامۆستا بکـرێ، هـەروەها دەبێتـە بەربەسـتێکی گەورە لە بەردەم گەشە کـردن و گۆڕانکـاری و پێشـکەوتنی کۆمـەڵگا بـەرەو کەنارێکی روون و داهاتویەکی گەش و پرشنگدار. ئەگەر چـاوێك بـە مێـژوودا

---

(٣) بۆ نمونە سەیری دانپێدانانەکانی هـیلاری کلنتـۆن بکـە لــە کتێبەکـەی بـەناوی (بـژاردە سەختەکان).

بخشێنینەوە دەبینین ئەو دیاردەیە لە چەرخی هاوەڵانیش بوونی هەبووە بەتایبەت لە سەردەمی جێنشینی هەریەك لە پێشەوا عوسمان و پێشەوا عەلی کە دواتر ئەنجامێکی خراپی لێکەوتەوەو تا ئێستاش قسەو باسی سەر زاری دوژمنانی ئیسلامە، لە ئێستاشدا لە ناو بەشێك لە زانایان و بیرمەندان ئەو دیاردەیە هەستی پێ دەکرێ کە بە جۆرێك ئەو بۆچوونی ئەو قەبوڵ ناکات یان زۆر جار یەکێك قسەیەك دەکات هاوشانەکەی ڕەتی دەکاتەوەو لێی وەرناگرێ، چونکە بەبیردۆزی پلانگێڕی بیردەکاتەوەو پێی وایە لە قازانجی کەسێك یا لایەنێك قسە دەکات و شتە گشتیەکە تەسك دەکاتەوەو جۆرێك لە مەترسی دروست دەکات بۆ دەورووبەری خۆی. بەداخەوە هەریەك خۆی پێ ڕاستەو ئەوی تر بۆ ئاگری دۆزەخ دەنێرێ. ڕەنگە ئەوە زیاتر لە هۆکارێکی هەبێت بەڵام بە بڕوای من گرنگترینیان ئەوەیە هەمیشە لە خاڵی ناکۆك و جیاوازەکانمانەوە دەست پێدەکەین لە بری ئەو خاڵانەی کۆ کۆین لەسەری و هاوبەشن لە نێوانماندا. ئەوە بیرۆکەیەکی خراپ و مەترسی دارەو لێکەوتەی نەرێنی دەبێت، بۆیە پێویستە بەخۆداچوونەوەیەك هەبێ، هەروەها گرنگە چەند پرسیارێك بکەین و بە دوای وەڵامەکەیدا بگەڕێین لەوانە:

١. ئایا کێ موسڵمانەو کێ موسڵمان نیە؟ یا کێ بڕیار دەدا لە سەر موسڵمان بوونی کەسێك یا کافر بوونی؟

٢. مافەکانی ئەو کەسە چیە؟

٣. پاشان ئەرك و واجباتی چیە؟

٤. ئایا جیاوازی سیاسی یان نەتەوەیی یان ئاینزایی دەکرێ ببێتە مایەی کافر کردنی بەرامبەر؟

ئەگەر توانیمان ئەو وەڵامانە بدۆزینەوە ئەوە دەتوانین هەنگاوێکی باش بهاوێژین بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەو دیاردەیەو بچوك کردنەوەی، هەروەها چارەسەرێکیشە بۆ فێربوونی ئادابی گفتوگۆ لە ناو کۆمەڵگاو چین و توێژەکانی.

جارێکیان برادەرێك پرسیاری مەسیحیەکانی لێکردم کە ئایا کافرن یاخود نا؟ وەك ئەوەی ئیسلام و موسڵمانان هیچ گرفت و ئاریشەیەکیان نەبێت تەنها ئەوە نەبێت!، منیش بۆم ڕوون کردەوەو گوتم حوکمی کافر لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە، کافرێك کە شەڕانگێزەو دژی ئیسلام و موسڵمانان دەجەنگێ، جیاوازە لە گەڵ کافرێك کە دراوسێی موسڵمانانەو لە ژێر چەتری ئیسلامدا دەژیت و هیچ زیان و کێشەو گرفتێکی لە گەڵ ئیسلام و موسڵمانان نیە، هەروەها گوتم لە قورئاندا لە زۆربەی شوێنەکان بە(أهل الكتاب) ناویان دەبات و لە هەندێ شوێن بە کافر، پرسیاری ئەوەم لێ کرد ئەگەر تۆ دراوسێیەکی مەسیحیت هەبێت بە ئەهلی کیتاب بانگی دەکەیت، یان بە کافر؟ کامیان گونجاو و شیاو ترە؟ گوتی: ئەهلی کیتاب، بەڵام چونکە کاریگەری کەسانی تری بەسەرەوە بوو، ئەگەر قەناعەتی بکردایە ئەوە یەکسان دەبوو بە دەرچون لەو مەنهەج و پێڕەوی کە کاری بۆ دەکەن، ئیتر قەناعەتی نەهات، بۆیە کە گەڕایەوە بۆلای مامۆستاکەی خۆی کە برایەك بوو لەو توێژانەی کۆمەڵگا، پێی گوتبوو مامۆستا فلان نەیگوتووە مەسیحی کافرە، ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ مادام مامۆستا فلان نەیگوتووە مەسیحی کافرە ئەوە خۆی کافر بووە؟؟!!.

ئەندازیارێك خێزانەکەی کە سێ منداڵیان لە یەکدی هەیە تەڵاق دەدات لەبەر ئەوەی حیجاب ناپۆشێت، پرسیار ئەوەیە ئایا تێکدانی شیرازەی خێزان و تەڵاقدان و

دروست بوونی کێشەو نەمانی سەکینەت و بەزەیی و خۆشەویستی، مەترسیدار ترە یان نەپۆشینی حیجاب؟ کە ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو قەناعەتەی بۆ دروست بێت و حیجاب بپۆشێت، ئایا ئەوە کێشەی تێگەیشتنە لە دین؟ یاخود قەیرانی کەمی عەقڵە؟؟.

چەند مامۆستایەکی ئاینی لە پەیمانگایەکی تایبەت بە زانستی ئیسلامی لەوانەی ئەدیان دەکەون و ساقیت دەبن چونکە پێیان وایە دروست نیە ئەو وانەیە بخوێندرێت؟؟!!!

لەو ڕۆژە دەترسم کە بێباوەڕان شانازی بە درۆ و ناحەقی خۆیان دەکەن، موسڵمانانیش شەرم لە ئیمانی خۆیان دەکەن.

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب

# تەوەری سێیەم

## پلانی عەقڵ و ڕێبەرایەتی نەقڵ

سەرەتا چۆن دەتوانین بەپلانی عەقڵ و ڕێبەرایەتی نەقڵ شارستانیەت بونیاد بنێین؟ بۆ ئەو مەبەستە پێویستە بزانین بنەما سەرەکیەکانی بونیادنانی شارستانی چیەو لە کوێوە دەست پێدەکات، چونکە کاتێ مرۆڤ هۆکاری دواکەوتووی و نەبوونی هۆشیاری خۆی دەدۆزێتەوە چارەسەر ئاسان دەبێت و زاڵ بوون بەسەر کۆسپ و ئاریشەو گرفتەکان ئاسان و مسۆگەر تر دەبێت و ئەگەری خۆسەلماندن و هەستانەوەو ڕاپەڕین زیاتر دەبێت. ئێمە پێویستمان بەوە هەیە دوو کەس لێمان ڕازی بێت:

<u>یەکەم</u>: خۆت لە خۆت ڕازی بیت: دوو شت بەلای منەوە زۆر گرنگە:
أ. هەڵوێست: چونکە مامۆستا سەعید نورسی کە بیستی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانی "جلادستۆن" لە پەرلەمانی وڵاتەکەی قورئانێك بەرز دەکاتەوەو دەڵێ هەتا ئەو قورئانە لە ناو موسڵمانان بوونی هەبێت ئەستەمە بتوانین بەسەریاندا زاڵ بین، بۆیە دەبێت ئەو قورئانە لە سەر زەوی نەهێڵین یان پەیوەندی موسڵمانەکان بپچڕێنین لەگەڵ قورئان، ئەگەر تۆزێك بیر بکەینەوە لەو وتەیە هەست بە مەترسیەکەی دەکەین، جارێ هیچ کەسێك ناتوانێ قورئان لە ناو ببات یان لە سەر زەوی نەیهێڵێت، چونکە قورئان بۆ سەر زەوی هاتووە، خوای گەورە پارستنی ئەو قورئانەی لە ئەستۆی خۆی گرتووە، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ

﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾[4]، واتــە ئێمــە ئــەو قورئانــەمان دابەزانــدوەو هــەر خۆشمــان پارێزگاری لێدەکەین. بەڵام مەترسی دووەم هەوڵی پچڕاندنی پەیوەنـدی نێـوان مرۆڤە موسڵمانەکانە بە قورئانەوە، کە جەنابی وەزیر و هاوپیشەکانی لەو هەوڵە سەرکەوتوو بوونە تارادەیەك بەسەرقاڵ کردنی موسڵمانەکان بە شتی لاوەکەی و زۆر کەس هەر قورئانی بیر نەماوە، ئەوەیشی جاروبـار قورئـان دەخـوێنێ، ئاسـتی تێگەیشتنی کورتەو بێ ڕامانێکی قوڵ و بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروسـتە، بۆیـە ئەوە بەڵگەیە لە سەر ئـەوەی پەیوەنـدی موسـڵمان بـە قورئانـەوە بچـڕاوە، وە دروست کردنی پەیوەندی لە گەڵ قورئان لە سەر بنـەمای ڕامـان و بیرکردنـەوە دەبێت نەك تەنها خوێندنەوەی، مرۆڤ کتێبێکی ئاسایی دەخوێنێتەوە ئەگـەر چـەند جار دووبارەی نەکاتەوەو لێی ورد نەبێتەوە تێی ناگات، کەواتە بۆ قورئان ئـەولا ترە مرۆڤ بە ڕامانەوە لەگەڵی بژیت، هەتا لە کوردەواریش دەڵێن ئەگەر دەتەوێ خوا قسەت لە گەڵ بکات برۆ قورئان بخوێنە، باشە قسە کردن بۆ ئەوە نیـە تێـی بگەیت؟ لەو ڕوانگەوەیە شێخ سەعیدی نورسی بەرەنگاری دەکات و هەڵوێست وەردەگرێ و دەڵێ: (لأبرهن للعالم بأن القرآن شمس معنوية لا يخبو سناها، ولا يمكن إطفاء نورها)، واتە دەیسەلمێنین بۆ هەموو جیهان کە قورئان خۆرێکی مەعنەویـەو هەرگیز بریسکەی ون نابێت، وە ناتواندرێ نور و ڕوناکیەکەی بکوژێندرێتەوە.

---

(٤) الحجر: ٩.

ب. کردار: خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾(٥)، واتە ئەی موحەممەد بەو خەڵکە بڵێ ئێوە هەرچی دەتـوانن لــە کـاروکردەوە ئـەنجامی بدەن، چونکە خوا کاروکردەوەکانتان دەبینێت و(ئاگادارە بە نهێنی و ئاشکرای)، هەروەها پێغەمبەرەکەشی (ئاگادار دەکات کاتێك لە ژیاندایە، دوای وەفاتیشی بۆ خوای گەورە ئاسانە کـە نیشـانی بـدات)، هـەروەها ئیمانـدارانیش (ئاسـەوار و دەرەنجامی کردەوەکە دەبینن)، پاشان دەگەڕێندرێنەوە بۆلای ئەو خوایەی کە زانایە بە نهێنی و ئاشکارا، ئەوسا ئاگادارتان دەکات لەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کـە ئەنجامی دەدەن.

بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا کردار بەکێ دەکرێ و کام کردارە کە خواو پێغەمبەر و ئیمانداران دەیبینن؟ کردار هەمیشە بەکەسێك دەکرێ کە "کفـوء"، واتـە لــێ هاتوو بێت و ئەهلی جدیەت و کاراو ئەکتیف بێت، چونکە ئەگەر خۆت نەبووی بە بوونی دەورووبەرت ئەگەری سەرکەوتن زۆر مسۆگەر نیە، ئێمە زۆر خەڵکمان هەیە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان باسی جدیەت و سەرکەوتن و کۆڵنەدان دەکەن، بەڵام کە سەیری مێـژوو و کاروبـاری ڕابردوویـان دەکـەین ڕێـژەی جدیـەت و سەرکەوتن و ئەکتیف بوونیـان لــە خـوار ٤٠٪ وەیـەو بـەردەوام لــەبێ پلانـی شکستیان بەکارەکانیان هێناوە. بۆیە من وای دەبینم فەیلەسوفی یۆنانی "سوقرات" بۆیە هەمیشە ڕەخنەی ئاراستەی سیستەمی سیاسی وڵاتەکەی دەکرد و دواتر بوو بەقوربانی عەقڵی خۆی، چونکە ئەو فەیلەسوفە باوەڕی بە دیموکراسی نەبوو بەو

(٥) التوبة: ١٠٥.

مانایەی کە خەڵك هەڵبژێریٚ و دەنگی خەڵك ئامرزای بوونی تۆ بێت، پرسیار ئەوەیە ئەی ئەگەر خەڵك عەقڵی ئیکتیسابی نەبیٚ و نەیتوانی جیاوازی لەنێوان باش و خراپ و باش و باشتر و باشترین و...هتد بکات ئەوسا دەبیٚ چۆن بڕیار بدات؟ بۆیە "سوقرات" دەیگوت دەبیٚ مرۆڤ بە لێهاتووی خۆی پیٚ بگات و کەفائەت بنەمای هێزوتوانای مرۆڤ دەسەلمێنیٚ.

دووەم: خوا لێت ڕازی بێت: هەندێك پێیان وایە هۆکاری داڕوخان و بەرەو دوا گەڕانەوەو دروست نەبوونی کەسی بونیاد لەر سیٚ شتە: یەکەم: دوور کەوتنەوەیە لە خوا، دووەم: لاوازی گەرم و گوڕی ئاینیە، سێیەم: بلاّو بوونەوەی خیانەت لە نێو ڕیزی موسڵمانانە. لەو سۆنگەیەوە گرنگە ڕەچاوی پێنج خاڵی زۆر گرنگ بکرێت بۆ هەستانەوەی ئوممەت و دروست کردنی شارستانیەتی ئیسلامی و گەڕاندنەوەی هەیبەت و ڕەسەنایەتی ئیسلام و وەرگرتنەوەی جڵەوی ڕێبەرایەتی جیهان و گەردوون:

١. پێغەمبەران بکەینە پێشەواو پێشەنگی خۆمان و بەتایبەت پێغەمبەری ئیسلام لە گشت لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان و پرۆسەی گۆڕانکاری و هەستانەوە. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾[٦]، واتە سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە تا چاوی لیٚ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی

(٦) الاحزاب: ٢١.

قیامەت ئاواتیانە، هەمیشەو بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئـەنجام دەدەن و زمانیـان پاراوە بەیادی ئەو، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾(٧)، واتە بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیـدا بـوون نمونەیـەکی چـاکتان خراوەتـە بەرچـاو، هـەروەها دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِيهِمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ ﴾(٨)، واتـە سوێند بەخوا لـەسەر گوزەشتەو ژیانی ئیبراهیم و ئەواندا نموونەو پێشەنگێکی چاك هەیە بۆ ئەوەی چاویان لێ بکەن، بۆ ئەو کەسەی کە ئاوات و ئومێدی ڕەزامەندی خوایەو لە ڕۆژی دوایـی دەترسـێت و حیسـابی بـۆ دەکـات. لـە شـوێنێکی تـر دەفـەرموێ: ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾(٩)، واتـە سـوێند بـەخوا ئێمـە پێغەمبەرەکانمان ڕەوانە کردووە هاوڕێ لە گەڵ بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکرادا.

٢. دەست بە قورئانەوە بگرین وەکو دەسـتور و یاسـاو بەرنامـەو مەنهـەجی ئاسمانی. خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾(١٠)، واتە کتێبە ئاسمانیەکانیشمان هێنایە خوارەوە کە لەگەڵ ئەو

(٧) الممتحنة: ٤.

(٨) الممتحنة: ٦.

(٩) الحديد: ٢٥.

(١٠) الحديد: ٢٥.

پێغەمبەرانەدا بێت، وە تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ ڕوون کردونەتەوە تا خەڵکی بە عەدالەت و دادپەروەری ڕەفتار بکەن.

**٣. دانانی پێوەر لە کارەکانمان بۆ ئەوەی هزر و فیکرمان بەهەڵەدا نەچێ و زووتر ئامانجەکانمان بپێکین، هەروەها بۆ ئەوەی دادپەروەری بێتە کایەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾[11]، واتە کتێبە ئاسمانیەکانیشمان هێنایە خوارەوە کە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا بێت، وە تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ ڕوون کردونەتەوە تا خەڵکی بە عەدالەت و دادپەروەری ڕەفتار بکەن.**

**٤. چاکسازی لە پەیڕەو و پرۆسەی خوێندن و پەروەردە بکرێت وەکو بنەمایەك بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ و هەستانەوەو تەوفیق لە نێوان ڕەسەنایەتی ڕابردوو هاوچەرخ بکرێت. خوای گەورە دەفەرموێ:**

**﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾[12]، واتە هەر ئەو زاتەیە لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوەو دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراو نادیاریان پوختەو**

(١١) الحديد: ٢٥.

(١٢) الجمعة: ٢.

پەروەردە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گومڕایی و سەر لێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو.

٥. گرنگیدان بە پرۆسەی پیشەسازی و وزەو هەوڵی جدی بدرێت بۆ بەرەو پێشەوە بردنی ئەو کەرتە، چونکە کاراکتەرێکی بنەڕەتی و سەرەکیە لە دروست کردنی شارستانیەت و پێشکەوتنی هەر نەتەوەیەك. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾[١٣]، واتە ئاسنیشمان دروست کردووەو دامان بەزاندووە کە ماددەیەکی سەخت و ڕەقەو سود بەخشیشە بۆ خەڵکی، تا ئەوەی خوا دەیزانێ لە جیهانی واقیعیشدا دەربکەوێت کەکێ پشتگیر و لایەنگری خواو پێغەمبەرەکانیەتی لە کاتێکدا کە ئەو زاتە پەنهانە، چونکە بەڕاستی خوا بەهێز و بالادەستە.

دکتۆر عمادالدین خلیل[١٤] ئاماژە بە سێ سورەتی قورئانی دەکات کە هەر لە ناوەکانیانەوە بنەماکانی کۆمەڵگایەکی شارستانی دروست دەبێت ئەگەر عەقڵێکی ئەکتیڤی خاوەن پلان جێبەجێی بکات، ئەو سێ ناوە بریتیە لە سورەتی(الشورى، الحديد، القلم)، کە بەواتای ئازادی، هێز، زانست و زانین دێت. کە لەو خشتەی خوارەوە جوانتر دەردەکەوێت.

---

(١٣) الحديد: ٢٥.

(١٤) بیرمەندێکی ئیسلامی ناودارەو خەڵکی شاری موسڵە، مامۆستای مێژوو شارستانیەتە، بەندە شەرەفمەندم کە لە قۆناغی خوێندنی دکتۆرا قوتابی ئەو بوومەو وانەی پێگوتومەو فێری زۆر شتی کردم، تەنانەت ئاسۆی هزری من لای ئەو بیرمەندە کرایەوە.


مقومات الامة الحضارية في ثلاث سور قرآنية
الشورى
الحديد
القلم
تعني الحرية
تعني القوة
تعني المعرفة
ئازادی
هێز
زانست و زانیاری

# تەوەری چوارەم

# تۆ کێی ؟

سەرەتا دەمەوێ ئاماژە بەو نیعمەت و بەخششە خواییە بکەم کە مرۆڤەکانی پێ بەڕێز و پایەبەرز کراوە، ئەو بەخششە بریتیە لـە ئـامرازی عـەقڵ و توانـای بـیر کردنەوەی مرۆڤ، کە دواجار دەتوانێ ڕێگا تاریکەکان ڕۆشن بکاتـەوە، داهـاتوە نادیارەکان وێنا بکات، پلان ڕێژی بۆ ژیانی خۆی و خێزان و دەور و بەر و ئەوانی تر بکات، بۆ ئەوەی بتوانێ کەسێکی ئاسودەو خـۆش گـوزەران بێـت، زاڵ بێـت بەسەر هەموو لەمپەرەکانی پێشکەوتن و سەرکەوتن، جورئەتی ئەوەی هەبێت پێش بە قورساییەکانی ژیان بگرێت.

ئێمەی مرۆڤ دەبێ هەمیشە هەوڵدەین پاڵنەر بۆ خۆمان دروست بکەین، چونکە سونەتی ژیان بەو شێوەیە بەڕێوە دەچێت، خوای گەورە ئەو گەردوونە بەو شـێوە ڕێکو پێکو سیستماتیکە ئیدارە دەدات، ئەگەر مرۆڤەکان پاڵنەر بۆ خۆیان دروست نەکەن دواجار ناتوانن ئەو پەیمانەی بەخوایان داوە بیگەیەننە سـەر، دەزانـن ئـەو پەیمانە چیە؟ بەداخەوە زۆر کەس نازانێ ئەو پەیمانە چیە!! دەی تۆی خوێنەر تۆزێك بیر بکەوەو دەفتەر و قەڵەمێك لای خۆت ئامادە بکەو لای کەمی بە دێڕێك دوو شت بۆمن بکە، یەکەمیان پێناسەیەکی خۆت بکە، دووەمیان بزانە ئەرکی تۆ لـەو گەردوونە چیە، ئێستا ئامادەیت؟ باشە ئەگەر بەلاتەوە قورس بوو جێبەجێ کردنی ئەو داوایە، من هەوڵەدەم هاوکاریت بکەم، بەمەرجێك تۆ تەنها پێناسـەی خـۆت

بکە وەکو مرۆڤ، من پێت دەڵێم ئەرکت چیە! ئاشێ بڵێ ئەوەشیان قورسە بەلامەوە؟ کێشەی ئێمە ئەوەیە رێژەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان ناتوانن پێناسەی خۆیان بکەن لەو گەردوونەدا، لەهەمان کاتدا نازانن ئەرکیان چیە، من جارێکیان لە دانیشتنێکدا بووم، یەکێك لە ئامادە بووان ریشێکی دانابوو، سمێڵی بۆ کورت کردبۆوە، زۆر بە ئاسودەییەوە گوتی باشتر وایە خۆمان لە بەرپرسیاریەتی دوور بخەینەوە بۆ ئەوەی سەلامەت بین، یەکێکی تر قسەکەی بۆ تەواو کرد و گوتی بۆ ئەوەی لە رۆژی دواییدا لێپێچینەوەیەکی ئاسانمان لە گەڵ بکرێت، منیش گوتم ئەو بۆچوونە هەڵەیە، چونکە مرۆڤ بۆ وەرگرتنی بەرپرسیاریەتی لەو گەردوونە داندراوە، ئەگەر مرۆڤ خۆی بدزێتەوە لە بەرپرسیاریەتی حاڵمان لەو حاڵەی ئێستا باشتر نابێت، کە رەنگە لە ریزبەندی ئەکتیف بووندا ژمارەی پاش هەزارمان بەر بکەوێت. لەلایەکی ترەوە راستە ئێمە داوا دەکەین لێپێچینەوەیەکی ئاسانمان لە گەڵ بکرێت، واتە لە کەموکورپەکانمان ببوورێت، لێ بوردەو بەبەزەیی بێت بەرامبەرمان، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە دار لە سەر بەرددا نەنێین بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا بەسەلامەتی بۆی دەرچین. ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ پرسیارەکەی سەرەتا دوای ئەوەی تۆی خوێنەر کۆمێنتێکت لای خۆت تۆمار کردوە لە سەر پێناسەی خۆت و دیاری کردنی ئەرکت لەو گەردوونە، ئێستا بەراوردی بکە لەگەڵ ئەوەی من بۆم نوسیوی و بزانە چەند توانیوتە لە وەڵامە راستەکە نزیك بیتەوە، ئێستا بەلای کەمەوە چەند سودێکت بینی، بیرت کردەوە، عەقڵت بەکار هێنا، کۆمێنتت نوسی، چەند پێکات یاخود نا ئەوە زۆر گرنگ نیە، چونکە کاتێ مرۆڤ دەکەوێت یان هەڵە دەکات واتای ئەوە نیە کە دۆڕاوە، بەڵکو ئەگەر وازبهێنێت و هەڵنەستێتەوەو بێ ئومێد بێت ئینجا دۆڕاوی راستەقینەیە.

مرۆڤ ئەو جێ نشینەیە کە خوای گەورە لە سەر ئەو زەویەی داناوە بۆ ئەوەی ئاوەدانی بکاتەوەو پەی بەهەموو لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان و ئەو گەردوونە ببات، هەروەکو دەفەرموێ:﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾[(١٥)]، واتە پەروەردگار بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم(بۆ ئاوەدانی و دینداری).

لایەکی تری پێناسەی مرۆڤ بریتیە لە دەرکەوتن و لەبیر کردن، زانینی ئەو ئەنجامە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە دیاری کردنی ئەرکی مرۆڤ، کەواتە دەرکەوتن دەبێ ببێتە مۆرکی ڕاستەقینەی مرۆڤ و بوونی خۆی بسەلمێنێ لەهەموو لایەنەکانی ژیان، جێ پەنجەی دیار بێت، خاوەن هەڵوێست بێت، مرۆڤ دەبێ ئەو واتایە بەدەست بهێنێت سەرەتا لە خۆی، لە بەرنامەی، لە ژیانی، لە خێزان و منداڵەکانی، لە بنەماکانی، لە بەهاکانی، لە ڕەوشتی، لەو ئاینەی کە باوەڕی پێیەتی، لە جێبەجێ کردن و گەیاندنی، نابێ خۆی بشارێتەوە وەکو پەریەکان، نابێ خۆی بدزێتەوە، چونکە ئێمە پەیمانمان داوە هەڵگری ئەو ئەمانەتە بین کە ئاسمان و زەوی و چیاکان نەیانتوانی هەڵی بگرن، سەیرکە قورئان چی دەفەرموێ:﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾[(١٦)]، واتە ئێمە ئەو ئەمانەتەمان(ئەمانەتی قورئان) نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکاندا(یاخود پێشنیارمان کرد ئێوە ئەو ئەمانەتە

(١٥) البقرة: ٣٠.

(١٦) الاحزاب: ٧٢.

بگرنە ئەستۆ)، بەڵام هەمووان دەستیان پێوەناو ترسان لێی(پێـان چـاك بـوو هـەر فەرمانبەردار بن، سەر پشك نەبن)، کەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی خۆی، بەڕاستی زۆر ستەمکار و نەفام بوو(ئەگەر زۆرینە ڕەچاو بکەین). سەیرکە تەنها مرۆڤە خۆی دەردەخات و دەڵێ من هەم، کەواتە ئێستا نابێ پاشگەز ببێتەوە، هەڵاتن دواکەوتنی بەدواوەیە.

لێکەوتەی ئەو ئایەتە لای کەمی دوورخاڵی سەرەکیە:

١. هێزوتوانای مرۆڤ دەردەخات کە ئەگەر ورە بەرز بێت و تواناکانی خـۆی بخاتە گەڕ، بێگومان دەگاتە دەرەنجامێکی زۆر گەورەو پیرۆز.

٢. ئەگەر مرۆڤ خۆی لـە بەرپرسـیاریەتی دوورخسـتەوەو کڵاوەکـەی خـۆی گرت تا با نەیبات، ئەو کاتە وەکو ئەو ئاسمان و زەوی و چیاو چۆڵانەی لێدێت کە خۆیان سەرپشك نەکرد و ئەو بەرپرسیاریەتی و ئەمانەتەیان هەڵنەگرت، دواجـار نابێتە ژمارەیەك لـە ناو ژمارەکان و کەسایەتی و کەسێکی بێ ڕۆح دەردەچێت.

ئێستا تێگەیشتین کە پێناسەو ئەرکمان چیە، ئەی باشە بۆ دواکـەوتووین؟ بـۆ حاڵمان ئاوایە؟ بۆ خەڵك ئاراستەمان دەکات؟ بۆ عەقڵمان کار ناکات؟ بۆ؟ بـۆ؟ بۆ؟ کەواتە دەچینەوە سەر خاڵە جەوهەریەکە کـە بریتیـە لـەوەی چـۆن پاڵنـەر دروست کەین بۆ خۆمان، بۆ ئەوەی ببین بە ژمارە، بۆ ئەوەی شوێنێکمان هـەبێت لـە ڕستەدا، بۆ ئەوەی بەهەند وەربگیرێین، بۆ ئەوەی نەڵێین ئێمە لای کێین، بەڵکو بڵێین کێ لای ئێمەیە. دەزانن ئەگەر پاڵنەر نەبێت ژیان و زەوی چی بەسەر دێت؟

دووباره بیر بکەوەو کۆمێنتێك بنوسە، بەڵام پێش کۆمێنتەکەت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەوە، ئایا تۆ قوتابخانەت تەواو کردوە؟ ئایا تۆ دەوڵەمەند بویت؟ ئایا تۆ لە ژیانی خۆت ڕازیت؟ ئاسودەیت؟ ئایا توانیوتە ببیت بە کەسێکی کاریزما؟ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانت چۆنن؟ چەند دەوروبەرت لێت ڕازین؟ چویتیە ژیانی هاوسەرێتی؟ تا ئێستا پێشبڕکێت لە گەڵ خێزانەکەت کردوە؟ بۆ نمونە پێشبڕکێی خوێندنەوەی کتێب، خواپەرستی و...هتد. ئەگەر هەموو وەڵامەکان نەخێر بوون، پرسیار ئەوەیە بۆچی؟ ئەگەر هەموو وەڵامەکان بەڵێ بوون، چۆن توانیت بەوشێوەیە بیت، هەوڵدە کەسانی تریش فێر بکە، ئایا پاڵنەرێکت هەبوو؟ کەسێك هەبوو پێشبڕکێت لە گەڵ بکات؟ ڕکابەرێکی سەرسەختت هەبوو؟ سەیر کە خوای گەورە چی دەفەرموێ:

﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ﴾(١٧)، واتە ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵکی بەهەندێکی تر پاڵ نەنێت و دەفعیان نەکات و ململانێی پێشکەوتن نەکەن لەنێوان یەکتریدا، ئەوە سەر زەوی پڕ دەبێت لە تاوان و خراپە. لە شوێنێکی تر دەفەرموێ:﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾(١٨)، واتە خۆ ئەگەر خودا خەڵکی نەدا بە یەکداو حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، هەرچی شوێنی خواپەرستی جوولەکەو گاور هەیە لە خەڵوەتگەو

(١٧) البقرة: ٢٥١.

(١٨) الحج: ٤٠.

کڵێسا و کەنیسە، هەروەها مزگەوتانیش کـە نـاوی خـوای زۆر تێـدا دەبرێـت، هەمووی کاول دەکرێت، سوێند بێت بێگومان خوا ئەو کەسـە سـەردەخات کـە پشتگیری ئاین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خوا زۆر بەهێز و باڵادەستە. دەزانن بۆ ئەو پەرستگایانە وێران و کاول دەبن؟ چـونکە مونافەسەو پێشبڕکێی شەریفانە لە نێوان بەندەکانی خوا نامێنێـت کـە بریتیـە لـە بانگەشە کردنی کۆمەڵگا بۆلای خواو پشتیوانی کردنـی لـە دیـن بەشـێوەیەکی ڕاست و دروست، سەیرکە بۆ ئەوەی ڕۆحی پێشبڕکێ و مونافەسەو پاڵنان هەبێت لە نێوان مرۆڤەکان خوای گەورە هەموو پەرستگاکانی یەکسان کردووە لـە یـاد کردن و باس کردنی خوای پـەروەردگار، لەکاتێکـدا یـادی خـوا بەشـێوەیەکی ڕاسـتەقینە تـەنها لەمزگەوتـدا دەکرێـت و بـەس، خـۆ ئەگـەر یـادکردنی خـوا لەپەرستگاکانی تری جگە لەمزگـەوت ڕاسـتەقینەو بـێ خـەوش بوایـە کەواتـە شوێنکەوتوانی ئاینەکانی تر کێشەیان چی بوو تا ببنە موسڵمان.

واتای دووەمی پێناسەی مرۆڤ کە گوتمان لەبیر چونەوەیە، لە قورئانیش هاتووە کەدەفەروێ:﴿ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ﴾[١٩]. بەتێگەیشتنی من ئەوە بۆ ئەوەیە مرۆڤ تێبگات کە لە بیر چوونەوە یان کەوتن و شکسـت خـواردن واتـای دۆڕانی مرۆڤ نیە، بەڵکو دەبێت مرۆڤ هەمیشە ورەی بەرز بێت و لە ئەگەری هەر کەوتنێکدا پێویستە پلانی هەستانەوەی هەبێت و بێ ئومێد نەبێت لە ژیان و سارد نەبێتەوە لە جوڵەوەو کارکردن.

---

(١٩) الكهف: ٦٣.

**کەواتە ئەو بابەتە بە پرسیارێك لەتۆی خوێنەر کۆتایی پێ دێنم کە بریتیە لەوەی ئایا تۆ دەتوانی لە شوێنێکی بەرزی بۆ نمونە (١٠٠) مەتر خۆت هەڵدەیە خوارەوە؟ نەخێر ناتوانم، بۆ ناتوانی؟ ئەگەر مردم، ئەی ئەگەر بەدواتەوە بن بۆ ئەوەی بتکوژن و دەمانچە لەسەر سەرت ڕابگرن؟ خۆم فڕێ دەدەمە خوارەوە، کەواتە دەبێ خۆت پاڵنەر بۆ خۆت دروست کەی، ئێمەی مرۆڤ بۆیە ناتوانین سەرکەوتوو بین چونکە پاڵنەرمان نیەو دەترسین.**

# تەوەری پێنجەم

## کێ لای منە؟

کێ لای منە، ئەوە خاڵی سەرکەوتنی هەر مرۆڤێکە، چونکە کێشـەیەکی زۆر گەورە بەرۆکی مرۆڤ دەگرێت کە بریتیە لەوەی خـۆی خـۆی ئاراسـتە ناکـات، بەڵکو ئاراستە دەکرێت، واتە کەسێکی تر عەقڵی بـەڕێوە دەبـات. سـەیرە لات ئەگەر بڵێم ئەوەی بەعەقڵی خۆی بەڕێوە ناچێت دواجار وەکو پایسـکیل وایـەو خەڵکی تر لێی دەخورێـت. کەواتـە دەمانـەوێ بڵـێین چـۆن ببینـە سـەرکردەو پێشەوایەکی ڕاستەقینە، مەبەست لە ڕاستەقینە ئەوەیە کـە چـۆن بـە شـێوەیەکی کاریزمی موغناتیزی خەڵك دەکەیتە شوێنکەوتەی خۆت، نەك ئەوەی خەڵك بـە ناچاری شوێن کەوتەت بـن. زۆرجـار مامۆسـتایانی ئـاینی لــە مزگـەوت دەبیـنن خەڵکێکی زۆر لەدوایانەوە نوێژ دەکەن، بیرکردنەوەیان دەگۆڕێت، ئەوە منم ئەو هەموو خەڵکە لە وتارەکەم دانیشتووە؟ ئەوە منم پێشەوایەتی و پێش نوێژی ئـەو هەموو خەڵکە دەکەم؟ بەڵێ تۆی، بەڵام بزانە تۆ نیت کـە کۆیانـت کردۆتـەوە، بەڵکو ئیرادەیەکی ترە ئەو خەڵکەی ناچار کردووە بێنە بەر دەستی تۆ.کارەکەمان پیرۆزە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە هۆی هاتنی ئەو خەڵکـە کاریزمـایی ئێمـە نیـە بەرێژەیەکی زۆر کەم نەبێ. کەواتە سەرکردایەتی و پێشەوایەتیەکەشمان لە ڕووی ئیداریەوە ڕاستەقینە نیە، ئایا ئـەو خەڵکـەی نوێـژت لــە دواوە دەکـات و لــە

**مزگەوتدا پێشەوایەتی تۆی قەبوڵە؟ لە دەسەڵات و کاروبارەکانی تریشدا قەبوڵیەتی؟؟**

پرسیار ئەوەیە ئایا چەند بە عەقڵ و بیرکردنەوەی خۆمان بەرێوە دەچین؟ چەند توانیومانە کاریگەری نەریتی دەوروبەر لە سەر خۆمان کەم بکەینەوە؟ من جارێکیان چەند کەسێکم بینی بەیەکەوە ڕاوەستا بوون، مامۆستای قوتابخانە بوون، منیش بۆ لایان چوم دوو نامیلکەم بۆ بردن کە فەتوای زانایان بوو دەربارەی گرنگی بەشداری کردن لە هەڵبژاردن، یەکێکیان پێش ئەوەی بزانێ چی لەو نامیلکە نوسراوە گوتی ئەگەر عەقڵمان نەیگرێ وەری ناگرین، منیش بە هەڵم زانی وەڵامی بدەمەوەو قسەش قافی بێت زۆر خۆشە، گوتم بەڵام ئێوە خۆتان ئیدارەو ئاراستەی عەقڵی خۆتان ناکەن، بەڵکو ئاراستە دەکرێن لە دەرەوەی خۆتان، چیتان پێ بکوترێ ئاوا دەکەن، ئەگەر پێتان بڵێن نان مەخۆن نایخۆن، ناپرسن ئاخۆ بۆچی و لەبەرچی؟ لە ڕاستیدا ئەوە کۆست و کارەساتە باڵی کێشاوە بەسەر کۆمەڵگادا.

ئێمە چۆن دەتوانین گۆڕانکاری بەسەر ئەو نەریت و سەقافە نێگەتیڤە بهێنین؟ کاتێ مرۆڤ ئاوا بێ ئیرادە دەبێت، دواجار دەبێتە مایەی لاوازی باوەڕ و پرۆسەی ئاینداری، کۆمەڵگایەکی نەزان و ترسنۆك بەرهەم دێت، ئەوەش لە بەرژەوەندی بێ باوەڕ و بێ ئاینەکانە، فیرعەونیش کاتێ کە گەلەکەی خۆی دەترساند، گەلەکەی چونکە بێ ئیرادەو هەڵوێست بوون بەگوێیان دەکرد و ملکەچ دەبوون، ئیتر خوای گەورە تۆڵە لەو جۆرە مرۆڤانە دەسەنێت و دەیانکاتە پەندی زەمانە، هەروەکو دەفەرموێ:﴿ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ سَلَفٗا

﴿وَمَثَلًا لِلْآخِرِينَ﴾[20]، واتە فیرعەون هیچ نرخی دانەنا بۆ قەوم و گەلەکەی و ترساندیانی و بە سوکی سەیری دەکردن، ئەوانیش ملکەچ و فەرمانبەرداری بوون، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی فاسق و تاوانبار و گوناهکار بوون، خوا فەرمووی جا کاتێك ئێمەیان تووڕە کرد و ڕقی ئێمەیان هەستان، ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن، هەرهەموویانمان لە دەریا خنکاند و نوقم کرد، جا کردمانن بەپێشەنگی تیاچووەکان و پەند و عیبرەت بۆ خەڵکی تری دوای ئەوان.

لەو ڕوانگەیەوە پرسیارێکی مێژووی دێتە کایەوە کە بریتیە لەوەی چی وای کرد کە ئومەتی ئیسلامی ئاوا پاشەکشە بە خۆی بکات و ڕازی بێت بە گۆشەگیری و پەراوێز بوون لە مێژووی مرۆڤایەتی؟ چۆن و بەچ ڕێگایەك دەتواندرێ ئەو ئوممەتە هەستێتەوەو جڵەوی شارستانی وەربگرێتەوەو حەق و ڕاستی و دادپەروەری بەرپا بکاتەوەو بێتەوە شوێنی جارانی و کاروانی ژیانێکی ڕاست و دروست دەست پێ بکات؟

ئەوەی گرنگەو ئەرکی سەرشانی ئێمەیە بریتیە لەوەی ٢٪ی خەڵك بگۆڕین و ئەوانی تر دەبنە بەردەست و شوێنکەوتەیان، بگەڕێوە بۆ مێژوو موسەیلەمەی درۆزن(مسیلمة الكذاب)، خۆی ناوی خۆی بەخۆیەوەیە و زۆر ڕوون و ئاشکرایە، ئەو کابرایە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، لە هەمانکاتدا (١٠٠) هەزار شوێنکەوتەی هەبووە، پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو ڕێژە زۆرە هەمووی بێ عەقڵ و گێل و نەزان بووە؟؟ وەڵامەکەی بۆ خۆتان بدۆزنەوە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئێمە

(٢٠) الزخرف: ٥٤-٥٤-٥٦.

**بەس بووغان هەبێت بەسە خەڵك خۆی بەدوامانەوە دێت، چارلی چاپلن ئالآیەکی هەڵگرتەوە کە لە سەیارەیەك کەوتبوو، بەرزی کردەوە بۆ ئەوەی خاوەنەکەی بی بینێ، کەچی خەڵك وایان زانی خۆپیشاندالەو هەموویان لە دەوری کۆبوونـەوەو بوونە شوێنکەوتەی.**

**هەوڵ مەدە مرۆڤێك بیت هەڵە نەکەیت، چونکە ئەوە مەحاڵەو نابێت، بەڵام مرۆڤێك بە کە لە هەڵەکانت شت فێر بیت و سود وەربگریت**

# تەوەری شەشەم

## پێگەی عەقڵ و ڕۆڵی زانا لە بونیادنانی شارستانیدا

عەقڵ ئەو ئامرازە هەستیار و کاریگەرەیە کە ئەگەر لە شوێنی خۆی بجوڵێندرێ مرۆڤ بەرەو شارستانیەت و پێشکەوتن و سەرکەوتن دەبات. عەقڵ چیە؟ ئەی عەقلانیەت چیە؟ ئەی پەیوەندی لە نێوان تێگەیشتنی هەریەك لە چەمکەکانی عەقلانیەت و ئازادی و هزری و سیاسی و...هتد کە شارستانیەتی ڕۆژئاوا شانازی پێوە دەکات چیە؟

لەو بابەتەدا دەشێ مەبەستمان لە عەقڵ وەکو ئامرازێکی مەعریفەسازی بریتی بێت لە شێوەی بیرکردنەوەو ئەو مەنهەجەی کە شارستانیەت لە سەری گوزەر دەکات، بۆیە هەندێك لەو کەسانەی خۆیان بە ڕۆشنبیر ناساندوە زۆر جار باسی شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەکەن و جۆرێك لە سەر سامی خۆیان لە پێشکەوتن و ئەو تێگەیشتنە عەقلانیەی ئەوان دەردەبڕن، بەڵام بیریان چۆتەوە کە بونیادنانی شارستانی ڕۆژئاوا هەمان ئەو کۆپیەی شارستانیەتی ئیسلامیە لە ئەندەلوس و...هتد کە بونیادیان نا، هەمان مەنهەج و بیرۆکەیە کە لە پێش شارستانیەتی ڕۆژئاوادا شارستانیەتی ئیسلامی بەرجەستەی کردبوو دواتر ئەوان بۆ خۆیان قۆرخیان کرد و تۆزێك داهێنانیان تێدا کرد و جیاوازیان خستە نێوان ڕۆح و مادده و دیار و نادیار و ئێستا بووە بە پێشکەوتن بۆیان، ئیتر بونیادی شارستانی لە ڕۆژئاوا لە سەر مادده بینا کرا کە ئەوەش جیاوازە لە گەڵ شارستانیەتی ئیسلامی.

ئەگەر تۆزێك عەقڵمان بخەینە گەڕ و بیر بكەینەوە لە ڕێڕەوی عەقلانیەتی ڕۆژئاوایی بێگومان دەمانباتەوە بۆ هەمان ئەو عەقڵەی كە بەگەڕ خرابوو لە شارستانیەتی ئیسلامی لە پێشدا بەڵام بە پاشخانێكی جیاواز، بۆیە بەرنامەو پێڕەوی ئەزمونی كرداری بنەمایەكی سەرەكی بوو بۆ تەقاندنەوەو گرنگی دان بە زانست لە كاتی ڕاپەڕین و هەستانەوەدا، ئەگەر سەرەنج بدەین ئەوەش ڕەگ و ڕیشەكەی دەگەڕێتەوە بۆ زانست و زانیاری لە شارستانیەتی ئیسلامی، بەتایبەت لە بواری (طب و فەلسەفەو كیمیاو گەردوون ناسی و بیركاری)و...هتد لە پێش سەدەی (١٣)زاینی، كە كۆمەڵێك زاناو داناو فەیلەسوفی وەك فارابی و ئیبن سینا و غەزالی و فەخری ڕازی و ئەبوبەكری ڕازی و...هتد، خزمەتی گەورەیان بە ڕێڕەوی زانست و زانیاری كرد لە شارستانیەتی ئیسلامی.

پرسیار ئەوەیە چۆن دووبارە شارستانیەتی ئیسلامی بونیاد بنێینەوە؟ ئەو بابەتە بەلای منەوە زۆر هەستیارە، بۆ؟ چونكە ئەو سیستەمە پەیڕەو كراوەی تا ئەمڕۆ بەردەوام بووە هەندێكیان لە ڕۆژ ئاواو ئەوی تریان لە ڕۆژ هەڵات لە سەر چوار بنەمای سەرەكی بونیاد نراوە:

یەكەم: دیكتاتۆری لە سیاسەتدا.

دووەم: گەندەڵی لە ماڵ و سەروەتی خەڵكدا.

سێیەم: دارمانی ڕەوشت.

چوارەم: دواكەوتووی شارستانی.




**هۆکاری سەرەکی دروست بوونی ئەو چوار بنەمایەی باسمان کرد بریتیە لە بوونی فەساد و گەندەڵی، بۆیە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ:**

﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴾(٢١)، **واتە کاتێك بمانەوێت دانیشتوانی شار و شارۆچکەیەك لەناو ببەین، ئەوە سەرەتا فەرمانی گوێڕایەڵی دەدەین بە دەوڵەمەندەکان(کە گوێ بە حەرام و حەلاڵ نادەن، کە چاکەو چاکەکاری بکەن)، کەچی ئەوان یاخی دەبن و خراپەکاری دەکەن لە شارەکەدا، ئەوسا ئیتر شایستەی ئەوە دەبن کە بڕیاری ئێمە بەسەریاندا بسەپێندرێت، ئینجا ئێمەش کاولی دەکەین بەسەر یەکداو داروبەردی بەسەر یەکەوە ناهێڵین. ابن خلدونیش دەڵێ: (إذا تأذن الله بانقراض الملك من أمة حملهم علی ارتکاب المذمومات وانتحال الرذائل وسلوك طريقها).**

(٢١) الاسراء: ١٦.

من سەرەتا تیشکێکم خستە سەر شارستانیەتی ئیسلامی و ئەندەلوسم بە نمونە هێنایەوە، بەڵام دواتر هەمان ئەو هۆکارانە بوونە مایەی دارمان و لە ناوچونی ئەندەلوس و دواتریش دەوڵەتی عوسمانی.

با پێشمان شەرم نەبێت و نمونەیەکیش بە دەوڵەتی ئیسرائیل بهێنینەوە کە لەگەڵ ئەوەی ژمارەیان کەمە بەڵام تواناى داهێنان و (اختراع)یان بە چەندان جار لە موسڵمانان زیاترە، چونکە ئوممەتی ئیسلامی لە شارێگەی سەرەکی خۆی لای داوەو هەندێك لە زانایانی ئاینیش کە بە جێگرەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) لە قەڵەم دراون لە خەودا ماونەتەوەو بەئەرك و واجبی خۆیان هەڵنەستاون، هەروەکو پێشەوا ماوەردی دەفەرموێ:(والخلافة هي نيابة عن النبوة، في حراسة الدين وسياسة الدنيا).

شارستانیەتی ڕۆژئاوا جگە لە بەرنامە ئەزمونیەکەی لەو کاتەوە دەستی پێ کرد کە شۆڕش و ڕاپەڕین بەرپا کرا لە دژی کەنیسە بە پێشەوایەتی مارتن لوثر[٢٢]، چونکە پیاوانی ئاینی کەنیسە کەوتبوونە بازرگانی کردنەوە، بەڵام بازرگانی کەل و پەل نا، بەڵکو بازرگانی بەئاین (صكوك الغفران)، واتە کەنیسە بەهەشتی بە

(٢٢) مارتن لوثر لە ساڵی (١٤٨٣) زاینی لە شاری أیسلین لە ئەڵمانیا لە دایك بووە، دوابەدوای خوێندن و تەواو کردنی یاسا، دکتۆرای لە (لاهوت) واتە (الشريعة المسيحية) هێناوەتەوە لە زانکۆی فیتنبرج و وەکو مامۆستاش لە هەمان زانکۆ کاری کردوە . تێبینی: شۆڕشەکەی لوثر بەڕواڵەت ئیسلاحی بوو، بەڵام لە ڕاستیدا بانگەشەو گەڕانەوە بوو بۆ تەورات و ڕێبازی جولەکەو ئەوەی ئێستا پێی دەگوترێ بزوتنەوەی ئینجیلیەکان و دواجار ماسۆنیەت و سەهیۆنیەتیش دەرەنجام و لێکەوتەی ئەو شۆڕشە بوو.

برواداران دەفرۆشت و هەروەها لێبوردن و ڕەش کردنەوەی گوناهەکان و...هتد لە بەرامبەردا من دڵم نایە هەمان وێنا بۆ مامۆستاو زانایانی ئاینی ئیسلامی بکەم ئەگەرچی لێرەو لەوێ هەمان هەڵسوکەوت و کردار بەڵام بەجۆرێکی تر دەبیندرێ، ئەوەش وەکو کەسایەتی تاك ئەگینا ئاینی ئیسلام دایەنگەی شارستانیەت و عەقڵ و مەعریفەت و ئازادی و...هتد.

ئیتر زۆر گرنگە ئەهلی زانست و (أولوالعلم) و مامۆستای ئاینی بە عەقڵ و دیدێکی نوێوە وڵات بەرێوە بەرێوە بەرن... 

لا يصلح الناس فوضى لا سراة لهم

ولا سراة إذا جهالهم سادوا

لە بەرامبەر چوار کۆڵەکە نەرێنیەکەی باسمان کرد ئاینی ئیسلام جێگرەوەی هەیەو چوار کۆڵەکەی ئەرێنی بۆ دروست کردن و بونیادنانی شارستانیەتی ئیسلامی داناوە، کە بریتین لە:

یەکەم: باوەڕ بە شتە نادیار و پەنهانەکان.

دووهەم: زانستێکی بەسود.

سێهەم: ڕەوشت بەرزی.

چوارەم: ماددە.




**دکتۆرە "زیجرد هونکا"ی ئەڵمانی بکەم کاتێك دەربارەی ئیسلام دەڵێ: (لقد قدم الإسلام حضارة جديدة فريدة، جمعت بين الروح والأخلاق والعدة والمادة، والفرد والأمة، الواقع والخيال، الرجل والمرأة، لينصهروا في مشروع حضاري انفرد بقيادة العالم ثلاثة عشرة قرناً).**

**مرۆڤی کامڵ و تەواو لەو چوار کۆڵەکەوە کە ئیسلام دایناوە دروست دەبێ، دەبێتە خاوەن ویژدان و دڵێکی گەورە، هەروەها ئاراستەی دەکات بۆ ژیان لە گەڵ جیهانی ڕۆحدا، بەڵام ئەو لایەنە هەستیارە نادیارە کە بریتیە لە لایەنی ڕۆحی و لە شارستانیەتی ماددی ڕۆژئاوایی بوونی نیە، شۆڕشی شیوعیەت لە ٢٣ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧)زاینی لە سەر دەستورێك بونیاد نرا کە یەکەم ماددەی بریتی بوو لە:( لا إله والحياة مادة).**

**یەکێتی سۆڤیەت (١٥٠) هەزار مزگەوت و کەنیسەی ڕوخاند لەو ناوچانەی دەسەڵاتی تێدا هەبوو، بە ئامانجی پچڕاندنی پەیوەندی مرۆڤەکان بە ڕۆحەوە،**

نەوەیەکی لە سەر بنەمای باوەڕ نەبوون بە شتە نادیارەکان پەروەردە کرد.
بەبیرتان دەهێنمەوە مامۆستایەکی یەمەنی لە قوتابخانە وانەی بە منداڵەکان دەگوت و بیرۆکەی نەبوونی خوای بە گوێچەکەیاندا دەچرپاند، پێی دەگوتن ئەو پەرتوکە دەبینن؟ قوتابیەکان: بەڵێ، مامۆستاکە: کەواتە ئەو پەرتوکە بوونی هەیە، ئەوجارە مامۆستا پەرتوکەکەی بردە دەرەوەی پۆلەکەو گوتی ئەو پەرتوکە دەبینن؟ قوتابیەکان: نەخێر، مامۆستا: کەواتە پەرتوك بوونی نیە، پاشان مامۆستا لە قوتابیانی تەمەن (٧)ساڵی پۆلی دووی سەرەتایی پرسی ئایا ئێوە (الله) دەبینن؟ قوتابیەکان: نەخێر، مامۆستا: کەواتە(الله) بوونی نیە، بەڵام قوتابیەکی تەمەن (٧) ساڵی عاقڵ و ژیر هەڵدەستێتەوەو بە قوتابیەکانی هاوڕێی دەڵێ ئایا ئێوە عەقڵی مامۆستا دەبینن؟ قوتابیەکان: نەخێر، قوتابیە ژیرەکە: کەواتە مامۆستا شێتەو عەقڵی نیە.

لە کۆتاییدا زانای خاوەن عەقڵ پاڵپشت بە نیگای خوا دەتوانێ شارستانیەت بونیاد بنێ. خوای گەورە دەفەرموێ: (إقرأ) ئەوە بریتیە لە فێربوونی زانست و عەقڵ، بەڵام (باسم ربك الذي خلق) ئەوە پاڵپشتەکەیە. ئێمە نابێ تەوەکولێکی خورافیمان هەبێت، واتە نەجوڵێین و کار نەکەین و هەر بڵێین پشت بەخوا. ئەعرابیەك هاتە مزگەوتەکەی پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت)، حوشترەکەی لە گۆڕەپانەکە بەبەرەڵایی جێهێشت بێ ئەوەی بیبەستێتەوەو گوتی پشت بەخوا، کاتێ لە مزگەوت هاتە دەرەوە حوشترەکە نەمابوو، زۆر دڵ تەنگ بوو کە پشتی بەخوا بەستوەو ئێستاش حوشتر ڕۆیشتوە، پێغەمبەر پێی فەرموو جارێکی تر حوشترەکەت ببەستەوە ئینجا پشت بەخوا ببەستە.

ئەگــەر تەماشــای شارســتانیەتی فارســی بکــەین دەبیــنین ئــاگر دەپەرســتێ، شارستانیەتی ڕۆمانی خاچ و سێ کوچکە(التثلیث) دەپەرستێ، لە شارستانیەتی هیند و صین مرۆڤ ئەگەر نەخۆش بکەوێ ئەوە ڕۆحی خەراپ نەخۆشی خستوە، دەبێ بچێتە لای کاهینێك بۆ چارەسەر، بەڵام ئاینی ئیسلام بۆ ئەو کارانە هاتوە:

یەکەم: دروست کردنی زانا:﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمَۢا بِٱلْقِسْطِ ﴾[23].

دووەم: دروست کردنی سەرکردە: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾[24].

سێیەم: دروست کردنی پیاو: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُواْ تَبْدِيلًا ﴾[25].

چوارەم: ئەسپی هێناوە پێشی عەرەبانە.

پێنجەم: سوارچاك پێشی ئەسپ.

شەشەم: مامۆستا پێشی قوتابخانە.

حەوتەم: باوەڕ پێشی مزگەوت.

پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) سەرەتا لە شاری مەککەو دواتر لـە شـاری مەدینەو بەتاییەت لە مزگەوتەکەی توانی (١٣٠) هەزار کەڵە پیاو کە بریق بوون لە هاوەڵەکانی دروست بکات، یەکێك لەو کەڵە پیاوانە عبداللە ی کوڕی

(٢٣) آل عمران: ١٨.

(٢٤) الاحزاب: ٢١.

(٢٥) الاحزاب: ٢٣.

مەسعود بوو، هەرزەکارێکی بچوك و ڕەش ئەسمەر بوو، بەڵام خاوەن عەقڵ و ژیریەکی زۆر بوو، هەروەکو لە صەحیحی بوخاری هاتووە ئەو پیاوە (١٧١) ئایەتی لە زاری پێغەمبەرەوە وەرگرتووە بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك یارمەتی بدات، ئەو پیاوە(٧٠) دانیشتنی لە گەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) کردووە، دواتر عبداللە چی لێ هات؟ عبداللە بوو بە ئیمام لە شاری مەدینە، دواتر لە عێراق بوو بە ئیمام، ئەبو موسای ئەشعەری یەکێکە لە نەوەو زانست هەڵگرەکانی عبداللە، یەکێك لە قوتابیەکانی عبداللە ی کوڕی مەسعود ئەبو حەنیفەی نوعمانە (ڕەحمەتی خوایان لێبێت)، ئێستا عبداللە قائد و پێشەوایە، لەو جیهانەدا(٥٠٠) ملیۆن مرۆڤ شوێن کەوتەی عبداللە ی کوڕی مەسعودن، چونکە ژمارەی شوێنکەوتوانی ڕێبازی حەنەفی (المذهب الحنفي) ئێستا لە جیهان (٥٠٠) ملیۆن کەسن، یەك لەسەر سێی ئومەت لە سەر ڕێبازی حەنەفیدان کە بەروبومی تاکە کەسێکە ئەویش عبداللە ی کوڕی مەسعودە، هەروەها هاوەڵانی تر نمونەی عبداللە ی کوڕی عباس کە ڕەگ و ڕیشەی ڕێبازی شافیعی بەروبومی ئەو پیاوەیە، ڕێبازی پێشەوا مالیك دەگەڕێتەوە بۆ عبداللە ی کوڕی عمر، ڕێبازی حەنبەلی دەگەڕێتەوە سەر عەبادیلەو جابری کوڕی عبداللە و ئەبوهورێرەو عائشە. ئیتر ئیسلام کەڵە پیاوی لەو جۆرە دروست دەکات.




زۆربەی موسڵمانان گیرۆدەی دوو جۆر عەقڵ بوون، جۆری یەکەم: بریتیە لە عەقڵیەتی دواکەوتووی(العقل المتخلف)، جۆری دووەم: بریتیە لە عەقڵیەتی وێرانکاری(العقل التدميري)، بۆ ئەوەی لەو دوو جۆر عەقڵە خراپە ڕزگارمان ببێت، پێویستمان بە جۆری سێیەمە کە بریتیە لە عەقڵی چالاك و ئەکتیف(العقل الفعال).

نمونەی جۆری یەکەم عەقڵی دواکەوتوو ئێجگار زۆرە، ئەگەر دەتەوێت بیدۆزیتەوە بگەڕێوە بۆ قورئان و سیرەی پێغەمبەر و مێژوو.

نمونەی جۆری دووەم: عەقڵی وێرانکەر ئەوەشیان هەر زۆرە لە مێژووی مرۆڤایەتی، بچوك ترین لێکەوتەو دەرەنجامی ئەو جۆرە عەقڵە نمونەی جەنگی جیهانی دووەمە کە نزیکەی ٦٠ بۆ ٧٠ ملیۆن قوربانی لێکەوتەوە. دیارترینی ئەو

**عەقڵە وێرانکەرانە بریتین لە: قابیل، فیرعەون، هامان، قارِوون، جەنگیز خان، هۆلاکۆ، ستالین، هیتلەر، مۆسۆلۆنی، قەزافی، بەشار ئەسەد و...هتد.**

**نمونەی جۆری سێیەم: عەقڵی فەعال و چالاك، زۆر بە زەحمەت بەدەست دەکەوێت، دواجار حاڵی ئومەتیش بۆیە ئاوایە.**

# تەوەری حەفتەم

# لە بارەی فەلسەفەو ئاینەوە

فەلسەفەو ئاین ئەو دوو تەوەرە پڕ لە کێشمەکێشەی نێو کۆمەڵگا جۆر بە جۆرەکانن کە بە درێژایی مێژوو هەمیشە سەنگەریان لە یەك گرتوەو بەیەکەوە هەڵ نەکەوتوون، بەبۆچوونی من دوو هۆکاری سەرەکی هەبووە لەو نێوەندەدا کە وای کردوە ئەو دوو بابەتە دژ بەیەك بوەستنەوە:

هۆکاری یەکەم: بریتیە لە مارکسی و بێ دینەکان، کە هەمیشە تانەو تەشەریان لە ئاین داوەو بە ئەفسانە هەژماریان کردووە.

هۆکاری دووەم: بریتیە لە ئیسلامی توندڕەو کە هەمیشە زۆرێك لە بابەتە ئاینیەکانیانی بە خەتی سوور دانەوەو کەس مافی ئەوەی نەبووە قسەیان لە سەر بکات.

کاتێ هەر یەك لە چین و توێژەکانی کۆمەڵگا ئەو دوو چەمکە هەڵدەگرن و بەمەبستی وتووێژ و شرۆڤە کردنیان دەچنە لای مارکسیەکان دەڵێن برالە ئاینەکەی لێ بکەوەو باباسی فەلسەفە بکەین، لە بەرامبەردا کە دەچیە لای ئیسلامیە توندڕەوەکان دەڵێن کاکە فەلسەفەکەی لێ فڕێ بدەو باباسی ئاین بکەین، ئیتر لەو نێوەندەدا قەتیس دەمێنینەوەو هیچ هەنگاوێك بەرەو پێشەوە نانێین، بە بڕوای من ئەگەر واتایەکی ئاسایی و سادە بۆ فەلسەفە بکەین ڕەنگە بریتی بێت لە کۆمەڵێك پرسیار و گرنگ ترینیان ڕەنگە بریتی بێت لەوەی:

ئێمە چین؟ بۆچی هاتووین؟ بۆ کوێ دەچین؟ ئەو گەردوونە چۆن دروست بووە؟ سەرچاوەی دروست بوونی گەردوون چیە؟ ئایا سەرچاوەکەی سروشتە(الطبیعة) یاخود لەناکاوە(الصدفة)؟ عەقڵ چیە؟ شوێنی عەقڵ لە کوێیە؟ مردن چیە؟ ئەی شاراوەکان (الغیب) بۆ نابینین و...هتد؟

ئەوانە کۆمەڵێکن لەو پرسیارانە کە ڕەنگە مێژووی دروست بوونیان بۆ فەیلەسوف و فەلسەفەی یۆنانی بگەڕێتەوە کە چوار سەد ساڵ پێشی لە دایك بوونی حەزرەتی عیسایە (سەلامی خوای لێبێت)، بەلای هەندێکەوە ووروژاندنیان زۆر ئاساییەو بەلای هەندێکی تر بڤەو خەتی سورە.

هەڵبەتە مەبەستمان لە فەلسەفە لایەنە میتافیزیقیەکەی نیە، چونکە لە ئیسلامدا بابەتی غەیب و شتە نادیارەکان قسەیان لەسەر ناکرێت، لەو سۆنگەیەوە من بەش بەحاڵی خۆم پێم وایە هەمیشە فەلسەفەو ئاین دوو ڕووی یەك دراون و بێ یەکتری هەڵ ناکەن، چونکە هەموو ئەو پرسیارانەی سەرەوە ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین لە قورئاندا وەڵامەکەیان بوونی هەیە، بۆ نمونە لە قورئانـدا هاتوە ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾[٢٦]، واتە خوای گەروە خالق و دروست کەری هەموو شتێکە، فەلسەفە لێرەدا پرسیارێك دەوروژێنێت و دەڵێت ئەی ئەگەر خوا خالق و دروست کەری هەموو شتێکە ئەی کێ خالق و دروست کەری خۆیەتی؟

ئەگەر سەرنج بدەین لە قورئان بەبێ دەمار گیری و کافر کردنی خەڵك لەسەر وەها پرسیارێك دەبینین وەڵامەکەی هەیە کە بریتیە لە ئایەتی

---

(٢٦) الزمر: ٦٢.

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾[27]، واته هیچ شتێك لەو شتانەی خوا دروستی كردوە وەكو خوا نیە، واته خوای گەورە (شـيء)ی دروست كردوە بەڵام خۆی (شـيء) نیە، بەڵكو خوا بوونە، كەواتە ئەگەر خوا دروست كەری هـەموو (شـيء)ێكـە، بەڵام چونكە خۆی (شيء) نیەو هیچ (شيء)ێك لەوانەی كە دروستی كردوە لەو ناچن بە پێی ئایەتی ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾[28]، كەواتە خوای گەورە لە كەس دروست نەبووە چونكە (شيء) نیە تا دروست بكرێت یان كەسێك دروستی بكات، بۆیە بەو شێوەیە قورئان وەڵامی فەلسـەفە دەداتەوە زۆر بە سانایی.

بۆ تەئكید بوون لـەوەی باسمان كرد با بچینە خزمەت نمونەیەكی تر لـە قورئان، تەماشا بكەن خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویستانی زانست، لـە باسی موسا سەلامی خوای لـە سەر بێت لـە قورئان هاتوە: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾[29].

ئەوە موسایە پێش پرسیار گەلی فەیلەسـوفەكان داوای ئـەوەی كـردوە خـوا ببینێت، بەڵام خوا دەفەرموێ: ناتوانی من ببینی! بۆ؟ چـونكە موسـا (شـيء)ە، وە

(٢٧) الشورى: ١١.

(٢٨) الشورى: ١١.

(٢٩) الاعراف: ١٤٣.

یەکێکە لە دروست کراوەکانی خوا، بەڵام خوا (شيء) نیە تا خۆی بە (شيء)ێك پیشان بدات وەکو خۆی، یاخود بەلای کەمەوە هیچ خاڵێکی هاوبەشیشیان نیە تا بەڵگە بێت بۆ بینینی خوا، لەبەر ئەوە ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین خوا داواکەی موسا دەگۆڕێ بۆ شتێکی تر کە (شيء)ەو وەکو موسا دروستکراوی خوای گەورەیە، ئەویش بریتیە لە چیا (الجبل)، وە خاڵی هاوبەشیان هەیە کە بریتیە لەوەی هەردوو کیان (مادده)ن.

یەکێ لەو جیاوازیانەی کە لە مرۆڤدا هەیە ئەوەیە کە مرۆڤ بەرێز ترین و باشترین دروستکراوەکانی خوای باڵا دەستەو شێوەو پێکهاتەکەی وای کردوە کاریگەری زۆری هەبێت لە سەر دەورو بەری خۆی، وە ئەو شێوە تەرکیبەی کە هەیەتی لەخۆوە دانەندراوە بەڵکو بەشێویەکی ئامانج دار و بۆ مەبەستێکی گەورە ئامادە کراوە لە لایەن خوای گەورەوە، ئەو ئامانجە بریتیە لە ئاوەدان کردنەوەی سەر ئەو زەویەو هەوڵی ئاشکرا کردنی نهێنی یاسا گەردوونیەکان بدات، بۆیە بە باڵایەکی بەرز و ستونی هێناویەتیە بوون بەو مەبەستەی هەمیشە مرۆڤ بەرەو لوتکەو بەرزی و بڵندی هەنگاو بنێ، وە ئەو قەد و باڵایەی بە دەماغ و عەقڵ و هەستەوەرەکان بەهێز و دەوڵەمەند کردوەو توانایەکی لە ڕادەبەدەری پێ بەخشیەوە، ئەوەش بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاریەکان و گفتوگۆ و بەراورد کردن و شیکردنەوەیان و دوا ئامانج بۆ ئەوەی بگاتە شتە نادیارە ماددیەکان بەتایبەت ئەو شتانەی کە دەشێ مرۆڤ دەستی تێوەربدات. من جارێکیان لە وتارێکدا پرسیارم کرد ئایە یەکەم کەس کێیە چوە بۆ ئاسمان؟ یەکێك گوتی مارکۆنی، ئەوی تر گوتی بە تەئکید ئەمریکیەکان بوون، یەکێك گوتی ئیتالیا،

کەسی بەخەیاڵی دانەهات بڵێ یەکەم کەس پێغەمبەرە چوە بۆ ئاسمان بۆ ئەوەی بەڵگەو نیشانەکانی خوا ببینێت، ئەوەش ئامانجی سەرەکی مرۆڤە لەو گەردوونەدا بگەڕێ و ببینێ و ببیستێ بۆ ئەوەی هێز و دەسەڵاتی خوای بۆ دەر بکەوێت، پێغەمبەریش هەر ئەوەی بینی، دەی یەکەم ئایەتی سورەتی ئیسرا بخوێنەوە، کە دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا﴾[٣٠]، واتە پاك و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەوی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا بەبەندەی خۆی محمد(درودی خوای لێبێت) لە مزگەوتی حەرام(کەعبە)وە بۆ مزگەوتی ئەقسا لە (بیت المقدس) کە دەوروبەریمان پیرۆز و پڕ بەرەکەت کردووە، تا هەندێك نیشانەو بەڵگەو دەسەڵاتداری و توانایی خۆمانی نیشان بدەین. ئیتر بەو گەڕان و لێکۆڵینەوەو پرسیار کردنە مرۆڤ دەتوانێ هەموو ئەو یاساو سونەنە گەردوونیانە بدۆزێتەوە. لە ڕووی جیۆلۆجیەوە مرۆڤ توانی دابەزێتە نێو زگی زەویەوەو بە پێچەوانەشەوە توانی سەرکەوێتە سەر مانگ و تەنانەت هەندێ لەو بەردانەشمان بۆ بهێنن، هەروەها دۆزینەوەی چەند ئەستێرەیەکی تر، وە لەمەولا زیاتریش بەرەو پێش دەچێت چونکە ئەوە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای باڵا دەستە، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾[٣١]، واتای سولتان زانست و بیرکردنەوەو بەکارهێنانی عەقڵ و لێکۆڵینەوەیە لە دەروونی خۆمان و

(٣٠) الاسراء: ١.

(٣١) الرحمن: ٣٣.

دەوروبەرمان، بۆیە خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات پاش ئەوەی فێری کردین چۆن هەموو ئەو هۆکارە پێویستانە کە یارمەتی مرۆڤیاندا بۆ دروست کردنی ئەو شارستانیە ماددیە گەورەیە، لەبەرامبەردا هەموو دروست کراوەکانی تر هیچ پێشوەچونێکیان بەخۆیانەوە نەبینیوەو هەر لە شوێنی خۆیانن و هەرواش دەمێننەوە، چونکە ئەوان بۆ هیچ کار و ئامانجێك ئامادە نەکراون.

بۆیە هەموو ئامرازەکانی مەعریفە سازی بۆ مرۆڤ فەراهەم کراوە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە خۆشەویستی مەعریفە سازی لە ناخی مرۆڤەکان چەسپێندراوە، هەربۆیە دەبینی زۆرجار مرۆڤەکان لە سنوری خۆیان دەردەچن و تەنها ئیکتیفا بە مەعریفەو یاساو ڕێساو سونەنە گەردوونیەکان ناکەن بەڵکو پرسیاری زۆر دەربارەی جیهانی نادیاریش (عالم الغیب) دەکەن و حەز دەکەن شتی دەربارەوە بزانن، چونکە کاتێ مرۆڤ درك بەو ڕاستیانە دەکات کاریگەری ئەرێنی زۆر لە سەر ژیانی دونیای بەجێ دەهێڵێ هەم لە ڕووی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوت و...هتد، چونکە مرۆڤ هەمیشە حەز بە مانەوە دەکات و ئارەزووی مردنی نیە، هەروەکو بابە گەورەمان ئادەم لە خۆشی مانەوە فەرمانی خوای گەورەی شکاند و لاملی کرد، ئەوەش بۆ گەیشتن بە لوتکەی هەموو ئەو ڕاستیە نەزاندراوانەی دەوروبەری مرۆڤ، تەنها ئادەمیش نا بەڵکو حەزرەتی موساش داوای ئەوەی کرد کە خودی خوا ببینێ، ئیبراهیم پێغەمبەر داوای کرد لە خوا کە ببینێ چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە، بەڵام خوای گەورە ئاراستەی هەریەك لە موساو ئیبراهیمی کرد بۆ بینینی چیایەکە بۆ ئەوەی بزانن چ ڕووداو گەلێکی بەسەر دێت کە لە گەڵ سروشتی ماددی هەردوکیان بگونجێ چونکە ئەوان ئامادە نەکرا بوون بۆ ئەوەی ئاگاداری جیهانی

نادیار بن، ئیتر ئەگەر گەورە پێغەمبەران بەدوای ئەو حەقیقەتانە گەڕابن دەگونجێ مرۆڤی ئاساییش ئەو هەوڵـە بـدات بـۆ گەیشـتن بـە نهێنیـەکانی ئـەو جیهـان و گەردوونە فراوانە.

دڵی مرۆڤ بریتیە لەو ئەندامە یاخود ئەو ماسولکە هەستیارەی کە خوێن دابەشی سەر هەموو لایەنەکانی جەستەی مرۆڤ دەکات، ئەو ماسولکەیە (دڵ) لە ڕۆژێکدا (١٠١) هەزار جار لێ دەدات، بۆیە دڵ گرنگی و بەرپرسیاری سەرەکیە لە مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا بەشێوەیەکی ساغ و سەلامەت، هەروەها جەرگ و دەماغ و گورچیلەو ڕیخۆڵەکان و...هتد، ئەو دڵە شوێنی خۆشەویستی و یادەوەری و زانست و چاکسازی و گەندەڵ سازی نیە، وەکو بەڵگەیەکیش ئەگەر دڵی مرۆڤێکی بالغی عاقڵی زاناو خاوەن ئەزموون و یادەوەری بگۆڕین بە دڵی مرۆڤێکی ئاسایی یاخوود دڵێکی دەسکرد ئەوە ئەو مرۆڤە دڵ گۆڕاوە هەروەکو پێشوو دەمێنێتەوەو هیچ گۆڕانی بەسەر نایەت، لەگەڵ ئەوەی باسمان کرد هێشتا مرۆڤ پێی وایە کە دڵ جێگای سۆز و خۆشەویستی و هەموو ئەو شتانەیە کە باس کرا، بەڵام هۆکارەکەی ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە تاوەکو ئێستا مرۆڤ نەیتوانیوە ناسنامەی عەقڵ دیاری بکات و شوێنەکەی بزانێ، چونکە ئەو شتێکی دیاری کراو یان هەست پێ کراو نیە، لەگەڵ زۆربەی بۆچوونەکان پێیان وایە دەماغ شوێنی عەقڵەو هەندێکی تریش دەڵێن مەبەست لە وشەی (القلب) عەقڵە (العقل)، پاڵپشت بەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى

ٱلصُّدُورِ ﴾[٣٢]، واتە ئایا ئێوە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون بە دڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە(کوان خەڵکانی ڕابردوو؟ ئەو شارانە بۆ کاول کران؟ کێ ئێمەی دروست کردووە؟ ئامانج لە ژیان چیە؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنبێت چاویان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کەوان لە سینەکاندا(چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە).

پێشەوا شافیعی بۆچوونی وایە کە عەقڵ لە ناو دڵدایەو بۆچوونەکەشی زۆر دروستە. کەواتە ئێمە بۆ ئەوەی بگەین بە زانست و مەعریفەسازی دەبێ بزانین ئامرازی ئەو مەعریفە سازیە چیە؟ لێرەوە دەکەوینە نێوان سێ ڕێبازی لە یەکتر جیاواز:

یەکەمیان: بۆچوونی ئەوانەیە کە پێیان وایە پێنج هەستەوەرەکە هۆکار و ئامرازی مەعریفە سازین، وە هەر ئەوانە دەمان گەیەنن بە ڕاستی و دروستی شتەکان، بەڵام کاتێ دەچینە ژێر ڕکێفی ئەو بۆچوونە حەتمەن دەبێ دوور کەوینەوە لە جیهانی نادیار (عالم الغيب) کە مەبەستی سەرەکیمانە، بەڵکو ئەو ڕێبازە لە بنەڕەتدا باوەڕی بە جیهانی نادیار نیەو ئینکاریشی دەکات "جملة وتفصيلاً"، ئیتر شاراوە نیە ئەوەی لە جیهانی نادیارە بریتیە لە خودا، پێغەمبەران، واتە کە باوەڕ بە خودا نەبوو بە پێغەمبەران هەرنابێت بۆیە ئەوانیشمان لە گەڵ جیهانی نادیار پۆلێن

---

(٣٢) الحج: ٤٦.

کردوە، ئەگینا پێغەمبەران نادیار نین، بەڵام سەرچاوەی پەیامەکەیان لـە خـوداوە دێت کە نادیارە، ئینجا ڕۆژی دوایی.

دووەمیان: ئەوانەن دەڵێن عەقڵ هۆکار و ئامرازی مەعریفە سازی و گەیشـتن بە ڕاستیەکانە، ئەو ڕێبازە پێی وایە دەبێ ئەم گەردوونە خالق و خاوەنێکی هەبێت و تواناو قودرەت و حیکمەتی بێ سـنوری هـەبێت، بـەڵام ئەوانـەش لـە بابـەتی پێغەمبەران و زیندوو کردنەوەو ڕۆژی دوایی کۆك نین و ڕێك نەکەوتوون.

سێیەمیان: ئەوانەن کە پێیان وایە بصیرەی ناوەوەی مرۆڤ(البصـیرة الداخلیـة)، ئامرازی مەعریفە سازی ڕاستی و دروستە، ئەو ڕێبازە خالق و مەخلوقی تێکەڵ و ئاوێتەی یەکتری کردووەو بەناوی خوا قسە دەکـەن و خـواو دروسـتکراوەکانی یەکسانی یەکتر دەکەن، ڕەنگە کورتەی پەیامەکەیان ئەوە بێت کە خوا بوونی نیە لە دەرەوەی دروست کراوەکانی، وە ئەوان پێیان وایە جیهانی نادیار بوونی نیـەو هیچ بەڵگەی حسی و عەقڵی و لۆژیکی لە سەر نیە.

# تەوەری هەشتەم

## چۆن دەبیتە کەسێکی داهێنەر؟

داهێنان و نوێخوازی سەرەتا لە مرۆڤەکان خۆیانەوە دەست پێدەکات، چونکە زۆربەی داهێنەرەکان سەرەتا لە ژینگەیەکی ناتەندروست و سنوردارەوە دەستیان بە داهێنان و هەنگاونان بەرەو سەرکەوتن کرد، دوای ئەوەی چەندین جار شکستیان هێناو کەوتن، بەڵام لەناخی خۆیان نەڕووخان و تووشی بێ ئومێدی نەبوون، بۆیە پێش ئەوەی مرۆڤ دەست بەداهێنان و هەنگاونان بەرەو سەرکەوتن بکات پێویستە کەش و هەواو ژینگەیەکی لەبار و گونجاو و ئەرێنی بۆ ڕۆح و دڵ و دەروونی خۆی دروست بکات، چونکە دواجار ئەوە هۆکارێکی جەوهەریە بۆ بەهێز کردنی ویست و ئیرادەی مرۆڤ و پاڵنەرێکی سەرەکیە بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجەکانی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾[٣٣].

لەو بەشەدا ئاماژە بە چەند ڕێکار و بنەمایەکی سەرەکی دەکەین وەکو ڕێخۆش کردنێك بۆ ئەوەی ببینە کەسی داهێنەر و سەرکەوتوو:

یەکەم: بوونی خواست و ئارەزوو (الرغبة): کاتێ ئەو خواست و ئارەزووە لە ناخی مرۆڤەکان دروست دەبێ، ئیتر کەش و هەواو هەلی زۆر دەڕەخسێ بۆ هەر

(٣٣) الزمر: ٥٣.

کەسێ کە بیەوە بیێتە داهێنەر و کەسایەتیەکی سەرکەوتوو، دەتوانێ ببێتە ژمارەیەك لە ناو ژمارەکان. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾(٣٤)، بەتێگەیشتنی من کرۆکی ئایەتەکە بریتیە لە دروست کردنی ویستی گۆڕانکاری لە ناخی مرۆڤدا بۆ ئەوەی هەمیشە بۆ قۆستنەوەی هەلەکان لە ئامادە باشیدا بێت، ئینجا خوای گەورەش هەلی بۆ دەڕەخسێنێ.

دووەم: ڕێگە بە خواست و ئارەزووەکانت بدە بۆ ئەوەی بەرەو سەرکەوتن بڕۆن، چونکە کاتێ ڕێگەیان بۆ بکەیتەوە ئەو کات دەتوانیت بگەیت بە حیکمەت و دانایی، وە هیچ ئاستەنگێك نیە ڕێگە لە مرۆڤ بگرێت بۆ ئەوەی نەگاتە ئامانجەکانی، هەروەك سوقرات دەڵێت چۆن بڕیار دەدەی کە ناتوانی ئەو شتە بکەی؟ یەکەمجار تاقی بکەوە، بۆیە ئەگەر هیممەتت بەرز بێت دەتوانی بە سەر چیا بەرزەکان بکەوی، وەکو دەڵێ:(همة الرجال تقلع الجبال)، ئەگەر پیاو ورەی بەرز بێت دەتوانێ چیاکان لە بن بهێنێت.

مامۆستایەك لە قوتابخانە وانەی زمانی عەرەبی بە قوتابیەکانی دەڵێت، یەکێك لە قوتابیەکان هاوار دەکات مامۆستا من ناتوانم فێری زمانی عەرەبی ببم، من بێزارم، من فێر نابم، زۆر قورسە، مامۆستا واز لە وانە وتنەوە دەهێنێت و لە سەر سەبورەکە وێنەی شوشەیەکی مل باریك دەکات و لە ناو شوشەکەش وێنەی مریشکێك دەکێشێت، ئینجا ڕوو لە قوتابیەکان دەکات و دەڵێ: کێ دەتوانێ ئەو مریشکە لەو شوشەیە بێنێتە دەرەوە بێ ئەوەی شوشەکە بشکێنێ و مریشکەکەش

(٣٤) الرعد: ١١.

بکوژێت؟ لەو کاتەدا سەرپەرشتیاری پەروەردەش لەوێ دەبێت و لە گەڵ قوتابیەکان تووشی سەر سوڕمان دەبێت ئاخۆ دەبێ نهێنی ئەو مەتەڵە چی بێت؟ ئیتر پاش هەوڵێکی زۆر وەڵامەکەی نادۆزنەوە، یەکێ دەڵێ شوشەکە بشکێنین، ئەوی تر مریشکەکە بکوژین، بەڵام ئەوانە پێشێل کردنی مەرجی یاریەکەیە، دواجار یەکێ لە قوتابیەکان دەست بەرز دەکاتەوەو بە نائومێدی دەڵێ مامۆستا کێ مریشکەکەی کردۆتە ناو شوشەکە با هەر ئەویش دەری بهێنێت! بەڵێ زۆر ڕاستە کەواتە ئێمە خۆمان ئەو قەناعەتەمان بۆ خۆمان دروست کردووە کە شت فێر نابین، کە بێ هیمەت بین، تەنها خۆشمان دەتوانین ئەو جۆرە بیرکردنەوە نەرێنیە لە مێشکی خۆمان دەربهێنین.

سێیەم: دانان و دیاری کردنی ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرا: کێشەی هەندێ تاکی ناو کۆمەڵگا ئەوەیە کە نازانێ بۆچی دەژی، ئامانجی نیە لە ژیان.

چوارەم: ئاستی ئامانجەکانت بەرز بکەوە: با ئامانجەکەت گەورەو بەرز بن، بە شێوەیەك ڕازی نەبیت تەنها بەگەیشتن بە لوتکە نەبێت، ئەوە بێ گومان دەگەیتە لوتکە، بۆ نمونە هیچ کەسێك ناتوانێ بگاتە ئاستی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) بەڵام دەبێ هەوڵی بۆ بدات. لە فەرموودەیەکدا هاتووە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) دەفەرموێ: (اذا سألتم الله فسألوه الفردوس، فانه أوسط الجنة، وأعلى الجنة، وفوقه عرش الرحمن، ومنه تفجر انهار الجنة)، واتە ئەگەر داوای شتێکتان لە خوا کرد ئەوە داوای فیردەوس بکەن، چونکە ناوەڕاستی بەهەشتە، بەرزترین جێگای بەهەشتە، لە سەروویەوە عەرشی خوا هەیە، لەوێدا ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن. ئەوە واتای ئەوەیە ئێمە دەبێ ئاواتمان زۆر بێت، نابێ وەکو هەندێ

کەس نەرێنیانە بیر بکەینەوەو بڵێین قەناعەت باشترین گەنجینـەی مرۆڤـە، بـەڵکو دەبێ ئەو قەناعەتە بگۆڕین بۆ (طموح) و ئاواتی زۆر لـە ژیان.

پێنجەم: (التعلم) فێربوون: کاتێ پرۆسـەی فێرکـاری و فێربـوون ڕادەوەسـتێ ژیانیش لـە گەڵیدا ڕادەوەستێ، ڕەنگە چاو پۆشیت لێ بکەم ئەگەر نەتزانی، بەڵام هەرگیز چاو پۆشیت لێ ناکەم لەوەی پێویستە بیزانی وفێری ببی بەڵام نەیزانی و فێری نەبی.

شەشەم: (العمل) کردار: "تۆماس هکسلی" دەڵێت: گەورەترین مەبەستی مرۆڤ لـە ژیاندا بە تەنیا زانین و ناسین نیە بەڵکو کردەوەشە. خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾[٣٥].

حەوتەم: هەوڵـەکانت چڕ بکەوە لـە سەر شتێ کە دەتوانی ئەنجامی بدەی نـەك لـە سەر شتێك کە ناتوانی ئەنجامی بدەی و پەی پێنابەی، پێش ئەوەی دەسـت پـێ بکەی خاڵی گەیشتن بە ئامانجەکەت دیاری بکە.

هەشتەم: سەرەتاکەت دیاری بکەو تا کۆتایی بەردەوام بە. "فرەنسیس دروبی" دەڵێت: (تحدید البدایة والاستمرار الی النهایـة)، هـەموو کـارێکی گـەورە دەبـێ سەرەتایەکی هەبێ بەڵام بەردەوام بوون تا کۆتایی ئەوە ڕاستەقینەیە.

نۆیەم: نەرم و گونجاو بە لـە کارەکەتدا، جار بەجار ڕێگاکەت بگۆڕە چـونکە ئەگەر لـە سەر یەك ڕێگا بەردەوام بیت هەمان ئەنجامت بۆ دێتەوە، یاخود ئەگـەر

(٣٥) التوبة: ١٠٥.

نەگەیشتیت بە ئامانجەکانت هۆکارەکان بگۆڕە، حیکمەتێکی جوان هەیە دەڵێ: (غیر وسائلك عندما لا تسير الامور كما يجب)، واتە ئامراز و هۆکارەکان بگۆڕە کاتێ کارەکان وەکو پێویست ناڕۆن. پیاوێکی کوێر لە ژێر دیواری یەکێك لە بینا بەرزەکان دادەنیشێ و کڵاوەکەی دادەنێت بۆ ئەوەی کەسێك خێری پێ بکات، لە تەختەیەکیش دەنوسێت: (انا اعمى أرجوكم سعدوني)، واتە من کوێرم ڕجاتان لێدەکەم یارمەتیم بدەن، پاش ماوەیەك پارەیەکی وای بۆ کۆنابێتەوە، چونکە خەڵکیش بێزار دەبێت، هەموو ڕۆژێ هەر کوێر، خەڵك وای لێدێت خێر ناکات، پیاوێکی شارەزا لە بواری ڕیکلام بەلایدا تێدەپەڕێت دەبینێ هیچ پارەیەکی وای بۆ کۆنەبوویەتەوە، ئەویش بێ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە تەختەکەی تەنیشتی دەبات و ئەو دێڕەی کە نوسرابوو من کوێرم ڕجام وایە یارمەتیم بدەن، ڕەش دەکاتەوەو دێڕێکی تری بۆ دەنوسێ کە بریتیە لە:(نحن في فصل الربيع، لكنني لا أستطيع رؤية جماله)، واتە ئێمە لە وەرزی بەهاردایین بەلام من ناتوانم جوانیەکانی ئەو بەهارە ببینم، بۆ؟ چونکە کوێرە، مرۆڤ کە ئەو دێڕە دەخوێنێتەوە بەزەی پێدا دێتەوە، بۆیە تەختەکەی هێنایەوە تەنیشتی و پاش ماوەیەك بینی کە پارەیەکی زۆری بۆ کۆبویتەوە، ئەوە گۆڕینی ئامراز و هۆکارە کاتێ کارەکان بەباشی ناڕواتە ڕێوە.

دەیەم: گەڕانەوەو هەستانەوە لە نوێوە: "ریتری بیتول" دەڵێ: دەرس وەرگرتن لەوەدا نیە کە چەند جار کەوتووی و دۆڕاندووتە، بەڵکو لەوەدایە کە تۆ چەند جار توانیوتە دووبارە هەستیەوەو دەست پێ بکەیتەوە.

یازدەهەم: تۆ بەرپرسی لە بڕیاردان بۆ ڕاوەستان و پەك كەوتنت، چونكە خەڵكی تر ڕەنگە بە شێوەیەكی كاتی بتوانن ڕات بگرن، بەڵام تاكەكەس كە بتوانێ بۆ هەمیشەو بەردەوام ڕات بگرێت ئەوە خۆتی نەكەسی تر. كابرایەك تووشی ترسنۆكی و بێ قەناعەتی هاتبوو، دەیگوت من گەنم و مریشك دەمخوات، كاكە دایكت چاك باوكت چاك، بەخوا تۆ مرۆڤی، تۆ گەورەی، ورەت بەرز بێت، تۆ گەنم نیت، گوتی من دەزانم گەنم نیم، بەڵام مەرج ئەوەیە مریشكەكە ئەو قەناعەتەی بۆ دروست بێت كە من گەنم نیم. سەیرە ئەو جۆرە مرۆڤانەش هەیە.

دوازدەهەم: پەلە مەكە بۆ ئەنجامەكەی، چونكە ژیان وەكو بەروبوومی میوە وایە كاتێ كە پێ گەیشت بۆ خۆی لێدەبێتەوە.

سێزدەهەم: بەردەوام بە لە هەوڵدان بۆ سەركەوتن: "كۆنفۆشیوس" دەڵێ: كەسی چاك و چالاك بە تەنیا نامێنێتەوە، بەڵكو دەورووبەری بۆ خۆی ڕادەكێشێ.

چواردەهەم: هەموو چركەیەك تۆ لێی بەرپرسیاری، هەوڵدە سود لە ژیانت وەربگرە بۆ ئەوەی داهاتووت دروست بكەی، بیرت بێتەوە كە كات ناگەڕێتەوە بۆ دواوە، ئەگەر فێرنەبووی و نەت زانی چۆن ژیانت ڕێك و ڕاست بكەیتەوە ئەوە تۆی بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە. قسەیەكی جوان هەیە دەڵێ: كات وەكو شمشێر وایە ئەگەر نەیبڕی ئەو دەت بڕێ. دەڵێن لە فەڕەنسا لە شوێنی ڕاوەستانی میترۆ(قیتار) نوسراوە بۆ نمونە كاتژمێر ٩:٥٥ خولەك میترۆ دەگاتە ئێرە، وە لە كاتژمێر ٩:٥٨ خولەك دەردەچێت و بەڕێ دەكەوێت، موسڵمانەكانی كە لە فەڕەنسا دەژین ڕەخنەیان گرت، گوتیان بۆچی دەنوسن ٩:٥٨ خولەك، دوو

**خولەك چیە، دە بنووسن كاتژمێر ٠٠:١٠ی تەواو، لەوەڵامدا گوتیان ئێمە لە ئاینی ئیسلامەوە فێری ڕێكخستنی كات بووین، ئەوە نیە لە مانگی ڕەمەزان كە بەڕۆژوون ئێوارە تا بانگبێژ بانگ نەدات ناتوانن ڕۆژووەكە بشكێنن ئەگەر نیو خولەكیشی مابێت!!.**

(قواعد الابداع)

| | | |
|---|---|---|
| ← اللحظة هي مسئوليتك | ← العمل | ← كن مرناً |
| ← أجج رغبتك في النجاح | ← التعلم | ← العودة من جديد |
| ← تحديد البداية والاستمرار حتى النهاية | ← الرغبة | ← لا تستعجل النتائج |
| ← أرفع مستوى أهدافك | ← الهدف | ← استمرار النجاح |
| ← أنت المسؤول عن قرار الإيقاف | | ← التركيز على الممكن |

# تەوەری نۆیەم

# فەلسەفەی چاکسازی و ئالیەتی زاڵ بوون بەسەر گەندەڵیدا

گومانی تێدانیه هەر یەك لەم چەمكانەی سەرەوە چەمكی قورئانین واته شتێك نیه داندراوی دەستی مرۆڤەكان بێت بەڵكو جێبەجێ كردن و دەست پێوە گرتنی دەست گرتنە بە پەتی خواوە كە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ﴾(٣٦)، كەواتە دەتوانین بڵێین یەكێ لە ئامانجی پێغەمبەران چاكسازی بـوە لە نێو كۆمەڵگا جۆراو جۆرەكان و گۆڕینیان بۆ كۆمەڵگایەكی چاك و پاك دور لە غەدر و ستەم و نەهێشتنی جیاوازی لە نێوان ڕەش و سپی، خوای گەورە لە باسی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێ:﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾(٣٧)، دەبینی شـوعەیب چـۆن دڵسـۆزی خۆی دەردەبڕێ بۆ خەڵكەكە بۆ ئەو كۆمەڵگایەی پڕ بوو لـە خراپـە كـاری وە خراپەكاریەكەشیان لە كێشانەو پێوانەدا بوو، ئەگەر سەرنج بدەین ئەمە جۆرێكە لە خاڵی هاوبەش لە گەڵ ئەم كۆمەڵگایانەی ئێستا كە دەسەڵات تیایدا هۆكاری سەرەكی خراپەكاریەكانە و بەشێك لە كۆمەڵگەشی بە دوای خۆیدا ڕاكێشاوە، وە جۆرێك فۆرماتی كردون هەموو شتێ بە چاوی دەسەڵات ببینن. وە ئەوەی لە گەڵ

(٣٦) آل عمران: ١٠٣.

(٣٧) هود: ٨٨.

بیر و باوەڕ و ڕەنگی ئەوان نەبێ نای خوێننەوە. ئینجا ڕۆشنبیر بێ یا مامۆستا یا گەل یا هەر چین و توێژێکی نێو ئەم کۆمەڵگایە بێت، واتە دڵسۆزی و پێشنیار و بۆچوونەکانی بەرامبەریی قبوڵ نیە وە زۆر جار بە چەواشەکاریش ناوزەندی دەکات. کەواتە دەتوانین بڵێین لە بەرامبەر چەمکی پیرۆزی چاکسازی چەمکێکی بۆگەن و قێزەون هەیە پێی دەوترێ گەندەڵی ئەویش لە بەڕێوەبردندا واتە نەبوونی داد پەروەری و یەکسانی، خواردنی ماڵی خەڵك، قۆرخ کردنی دەسەڵات، وە بەکار هێنانی بە شێوەیەکی نادروست، وەداپڵۆسینی خەڵك و تۆقاندنیان. ئیتر ئەمە لە گەڵ ئەوەی خوا پێی ڕازی نیە خەڵکیش قبوڵی ناکات، وە ڕۆژێك دەبێ دێتە سەر شەقام و ڕێگاشی لێ ناگیرێ چونکە دەتوانی ئەم خەڵکە ڕاپێچ بکەی و ملیان بە دەریاوە بنێی بەڵام ناتوانی بە زۆرە ملێ ئاویان دەرخوارد بدەی. کەواتە چاکسازی لێرەوە دەبێ دەست پێ بکات، وە یەکێ لە بنەماکانی چاکسازی دەبێ گشتگیر بێ بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان، وە ئەوەی جێگای پرسیارە ئەوەیە ئایا لە کوێوە دەست پێ بکەین لە تاکەکانی نێو کۆمەڵگا یا لە دام و دەزگاکانی حکوومەت؟؟ لە ڕاستیا ئەمە پرسیارێکی فەلسەفیە!!! کەواتە بە واتایەکی پوخت چاکسازی بریتیە لە ڕاست کردنەوەی خوارو خێچیەکان کە بوونەتە مایەی لادان لە ڕێگای ڕاست و دروست، بەم واتایە دەبێ لە سەرەتا چەند شتێ بێتەجێ لەوانە:

یەکەم: دەبێ چاکسازی بە شێوەیەکی گشتی بێ نەك تەنها لایەنێك لە لایەنەکان.

دووەم: دەبێ چاکسازی لە ڕەگ و ڕیشەو لایەنە شاراوەکانی دەسەڵات بێ نەك کۆ بکرێتەوە لە سەر چڵ و شتە دیارو لاوەکیەکان.

سێیەم: دەبێ هەموو لایەن و دام و دەزگاو تاکەکان پابەند بن پێوەی بە شێوەیەکی گشتی لە هەر ئاست و پلەو پایەیەك دابن بەبێ هەڵاوێردن. بەجێبەجێ بوونی ئەم سێ خاڵە وەڵامی پرسیاری پێشوومان دەست دەکەوێت کە دەڵێ لە کوێوەوە دەست پێ بکەین.

دیارە گەندەڵی یەکێکە لەو پەتایانەی کە زۆربەی وڵاتان بە گشتی و مرۆڤەکان بە تایبەتی تووشی هاتون و دوچاری ئیدمان بوونە پێوەی، وە بووە بە خورەوشتیان و ناتوانن وازی لێ بهێنن، بۆیە لە ڕوانگەی قورئانەوە دەمانەوێ تیشکێك بخەینە سەر ئەو بابەتە تائەو جێگەی دەتوانین قسەی لە سەر بکەین، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾(٣٨)، واتە بۆ لە ناو خەڵکی زەمانی پێش ئێوەدا کەسانی ژیرو دیندار نەبوون کە بەرگریان لە خراپەو تاوان بکردایە لە زەویدا .

ئەمرۆ ئەگەر بمانەوێ بە سەر دیاردەی گەندەڵی دا زاڵ بین و شوێنەواری لە ناو کۆمەڵگادا نەهێڵین، دەبێ لە سەرەتادا بزانین گەندەڵی و هۆکاری گەندەڵی چیە؟ بۆ ئەوەی بتوانین چارەسەرێکی ڕیشەیی بۆ لە بنەوە هەڵتەکاندنی ئەو دیاردەیە بدۆزینەوە، ئەگەر نا بە پێ چەوانەوە هەموو هەوڵەکانمان بە مایە پوچ دەبێ و بە زایە دەچێ.

(٣٨) هود: ١١٦.

**ئەگەر تەماشایەکی قورئانی پیرۆز بکەین دەبینین وێنایەکی تەواومان بۆ دەکێشێ لە سەر لادان و بە هیلاك چونی مرۆڤەکان، وە گرنگترین هۆکارەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:**

**یەکەم: یاخی بوونی کۆمەڵگا لە ژیانی دونیادا، واتە جۆرێك لە بێ ئومێدی ڕوی لەو خەڵکە کردوەو مرۆڤەکان دەسەڵات و هێزی خوای گەورەیان لە یاد چوەو هەموو عەقڵ و بیرو هۆشیان کورت کردیتەوە لە سەر ئەو دەسەڵاتە داندراوانەو پێیان وایە بە هیچ شێوەیەك ناڕواو لە ناو ناچێ، بەڵام ئەگەر سەیری قورئان بکەین بە پێچەوانەوە باس و سەربوردەی گەلانی پێش خۆمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ ﴾(٣٩)، واتە زۆر شارو شارۆچکەمان لە ناو برد کە دانیشتوانەکەی یاخی و لە سنور دەرچووبوون لە ژیانی دونیایاندا، وشەی (بطرت) واتای ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە هیچ شتێك نەبینی تەنیا ماددە و لەزەت نەبێ، لە گەڵ ئەوەی بە دوایان دادێ لە گەندەڵی و فەساد و...هتد.**

**دووەم: ستەم کردن ئینجا هەرجۆرە ستەمێك بێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا ﴾(٤٠)، واتە سوێند بە خوا بێگومان**

---

(٣٩) القصص: ٥٨.

(٤٠) یونس: ١٣.

ئێمە لە سەدەکانی پێش ئێوەدا خەڵکێکی زۆرمان لــە نــاو بــرد کــاتێ ستەمیان کردوەو ڕۆچون تیایدا.

سێیەم: دەرچون لـە فەرمانی خواو گوێ پێنەدانی، خوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾[41]، واتە تەنیا تاوانبارو لـە سنور دەرچوان نین تیا دەچن، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴾[42]، واتە کاتێ بمانەوێ دانیشتوانی شاروشارۆچکەیەك لە ناو ببەین ئەوە سەرەتا فەرمانی گوێڕایەڵیان پێ دەدەین بە دەوڵەمەندەکان کە گوێ بە حەرام و حەڵاڵ نادەن بۆ ئەوەی چاکەو چاکەکاری بکەن. کەچی ئەوان یاخی دەبن و خراپەکاری دەکەن لـە شارەکەدا، ئەوسا ئیتر شایستەی ئەوە دەبــن کە بڕیاری ئێمە بە سەریان دا بسەپێندرێت و لەناو ببردرێت.

چوارەم: کار نەکردن بە ئامۆژگاری پیاو چاکان و دڵسۆزان، خــوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ﴾[43]، واتە ئەوان باوەڕیان پێ نەکردن و بــە درۆیــان خســتەوە، ئێمــەش لــە ناومــان بــردن، هــەروەها دەفــەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾[44]،واتە بەڵام ئێوە دڵســۆزانتان خۆشــناوێ، وە ڕوبەڕویان دەبنەوە، هەروەها دەفەرموێ:

---

(٤١) الاحقاف: ٣٥.
(٤٢) الاسراء: ١٦.
(٤٣) الشعراء: ١٣٩.
(٤٤) الاعراف: ٧٩.

﴿ قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ ﴾(٤٥)، واتە كاتێ لە شكری پادشاكان چوبنە هەرشار و دێهاتێكەوە، وێران و كاولیان كردوەو تۆوی خراپەیان تیا چاندوە، وە پیاوە ناودارەكانی ئەو شوێنەیان زەلیل و ڕیسوا كردوەو هەمیشە ئەوە پیشەیانەو بەو جۆرە دەكەن و هەرواش دەبن، لە بەر ئەوە من بڕیارم داوە دیاریەكیان بۆ بنێرم.

بۆیە لە پیشەی گەندەڵ كاران ئەوەیە دڵسۆزەكان دوور دەخەنەوەو گەندەڵ كاران لە دەوری خۆیان دادەنێن، چونكە ئەگەر وانەبێ بەرتیل كاری خۆی ناكات.

پێنجەم: تێنەفكرین و بیر نەكردنەوە لە گوتارەكان و شوێن كەوتنی باب و باپیرانیان و تۆمەت باركردنی پێغەمبەران و شوێن نەكەوتنیان، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ أَمْ جَاءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ آبَاءَهُمُ الْأَوَّلِينَ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ بَلْ جَاءَهُم بِالْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾(٤٦)، واتە:

بێ باوەڕان ئەو گوفتارەیان لێك نەداوەتەوە یا خود وا دەزانن ئەم بەرنامەیەی كە بۆ ئەوان هاتوە بۆ باب و باپیرانیان نەهاتوەو ڕەوان نەكراوە، یان ئەوەتە

---

(٤٥) النمل: ٣٤-٣٥.

(٤٦) المؤمنون: ٦٨-٧١.

پێغەمبەرەکەیان نەناسیوەو ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی بڕوا بە پەیامەکەی نەهێنن و دژی بوەستنەوە، یا خود بێ شەرمانە دەڵێن شێتی سەری لێ تێکداوە، نەخێر وانیە بەڵکو ڕاستی و حەقی بۆ هێناون، بەڵام زۆربەیان ڕقیان لە ڕاستیەو حەز لە حەق ناکەن و پێی سەغڵەتن، ئەگەر حەق و ڕاستی شوێنی ئارەزووی ئەوان بکەوێت، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێواو تیا دەچون و سەرگەردان دەبوون.

بۆیە ناتواندرێ زاڵبین بە سەر گەندەڵی تەنیا بەوە نەبێ کە واقیعەکە بگۆڕین، چونکە گەندەڵی دروست نابێ تەنیا لە ڕێگەی هۆکارەکانیەوە نەبێ، وە تا هۆکارەکانیش بەردەوام بن گەندەڵیش بەردەوام دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾(٤٧)، واتە خوای گەورە هیچ گەل و قەومێك ناگۆڕێ تا وەکو لە ناخ و دڵ و دەرونی خۆیانەوە نەگۆڕێن.

بۆ ئەوەی هەوڵەکان بۆ چاك سازی و بنبڕکردنی گەندەڵی بگاتە ئامانجی خۆی پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێ:

١. دەبێ ئەوەی بانگەشەی چاکسازی دەکا خۆی کەسێکی پاك و بێ خەش بێ، بۆ ئەوەی قسەو کردارو گوفتاری شوێنەوارێکی باش جێ بهێڵێ، خۆ ئەگەر وانەبێ ئەوە خەڵك دەڵێن ئەگەر قسەکانی ڕاست بوایە خۆی جێ بە جێی دەکرد. بۆیە ئەگەر سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین دەبینین خوای گەورە گلەیی لە گوفتاری بێ کردار دەکات، وە بە خەشم و ڕقێکی گەورەی هەژمار دەکات، دەفەرموێ:

---

(٤٧) الرعد: ١١.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾(٤٨)، واتە بۆ گوفتارەکانتان بە کردار جێ بە جێ ناکەن، بەڕاستی ئەوە خەشم و قینێکی گەورەیە کە قسە بکەی و کردەوەت نەبێ . لێرەوە ئەگەر تەماشای پێغەمبەران بکەین (درودی خوایان لە سەر بێ) کە خوای گەورە هەڵی بژاردون بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەن لە ژێردەستەیی، چەوساندنەوە، کۆیلایەتی، گومڕایی، تاریکی، گەندەڵی، بۆ ڕوناکی و پێچەوانەی ئەوانی تر، بەڵام ئەوان پاك و بێ خەش بوون پارێزراو بوون لە گوناه و تاوان لە هەڵەو پەڵەی گەورە کە کاری گەری هەبێ لە سەر بانگەشەکەیان. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾(٤٩)، واتە خوای گەورە ئادەم و نوح و نەوەکانی ئیبراهیم و نەوەکانی عیمرانی هەڵبژاردوە بە سەر جیهاندا، هەندێکیان نەوەی هەندێکیانن خوای گەورەش بیسەر و زانایە. ئینجا خوای گەورە دەیان کاتە پێشەواو پێشڕەوی چاکە و چاکەکاری. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ﴾(٥٠)، واتە سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا چاکترین نمونەی تەواو و ڕێك و پێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ

(٤٨) الصف: ٢- ٣.

(٤٩) آل عمران: ٣٣-٣٤.

(٥٠) الاحزاب: ٢١.

وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾[51]، واتە ئەی ئیمانداران بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانـەی کـە لـە گەڵیدا بوون نمونەیەکی چاکتان خراوەتە بەر چاو.

بۆ ئەو مەبەستە جڵەوی دەسەڵات نابێت تاکڕەوانە بگیرێتە دەست بەڵکو دەبێ فرە لایەن بەڕێوە ببردرێ و پرس و ڕاو بیرۆکەی دڵسۆزانیش قەبوڵ بکرێ و ڕاوێژ هەبێ لە نێوان هەموو دەنگەکان، هەروەك خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾[52]، واتە کاروباریان هەردەم بە مشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکاریە. وە بە پێچەوانەی ئەوەی باسمان کرد ئیتر گەندەڵی سەرهەڵدەدا. لە گەڵ ئەوەشدا نمونەی ئیجابی و باش و ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە کورت ترین و باشترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، پێچەوانەکەشی هۆکارێك دەبێ بۆ زیاد بوونی گەندەڵی.

٢. نەبوونی ئامادەباشی کۆمەڵگا: پرۆسەی چاکسازی نابێ بە یەکجار بێ واتە تۆ بتەوێ لە چرکەیەکدا سەرتاسەری وڵات بگۆڕی لە خراپەوە بـۆ بـاش ئـەوە بەڕاستی لە جێگای خۆی نیە، بەڵکو دەبێ وەکو کارەکانی تری ئەو دونیایـە بـە پلەبەندی بڕواتە ڕێوەو یەك لە دوای یەك بێ، تۆ کاتێ بـە شـێوەی پلـە بەنـدی بانگەشەکەت بەڕێوە برد ئەوە خەڵك لێت تێدەگاو لە تۆمەت و شتی نابەجێ تـا ڕادەیەك دوور دەکەویەوە، وەکۆمەڵگاش ناکەوێتە تەوەتورو دودڵـی، ئـەوە بـۆ ئەوەیە کە خەڵك هەڵوێستێکی سلبی لە بەرامبەردا نەنوێنن. بۆیە پلـە بەنـدی و نەرم و نیانی و یەك لە دوای یەك بەرهەمی باشتری لێدەکەوێتەوە، خوای گەورە

(٥١) الممتحنة: ٤.

(٥٢) الشورى: ٣٨.

لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴾[٥٣]، واتە هەردوکتان بە نەرمی و بە جوانی گفت و گۆی لە گەڵدا بکەن بۆ ئەوەی یادەوەری وەر بگرێت، یان ترسی سزای ئێمە لە دەرونیدا جێگیر بێت، ئیتر ئەوە ڕەوشتی پێغەمبەران بوەو توانیویانە کۆمەڵگا ئامادە بکەن هەم لە ڕوی دەرونیەوە هەم لە ڕوی کردارەوە باشتر هەزمی بابەتەکەیان کردوەو وەریان گرتوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾[٥٤]، کەوابوو ئەی محمد تۆ بە هۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لە گەڵیاندا، خۆ ئەگەر تورەو قسە ڕەق و بێ بە بەزەیی بویتایە ئەوا هەموو لە دەورروبەرت بلاْوەیان دەکرد.

٣. دانایی: واتای ئەوەیە دەبێ چاکساز موراعاتی کات و شوێن و چۆنیەتی گەیاندنی پەیامەکەی بەڕون و ئاشکرایی بکات. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾[٥٥]، واتە بانگەواز بکە بۆ ڕێگەی خوا بە دانایی و ئامۆژگاری باش و گفت وگۆیەکی وا کە بە باشترین شێوە بتوانێ پەیام و بانگەشەکەی بگەیەنێ. حیکمەت: واتە تێرکردنی عەقڵ. ئامۆژگاری: واتە تێرکردنی سۆزو عاتیفە. کەواتە دانایی دانانی شتێکە لە شوێنی خۆی کە شوێنەواری کاریگەریەکەی دیار بێ، هەروەها وتارەکانی چڕ

(٥٣) طه: ٤٤.

(٥٤) آل عمران: ١٥٩.

(٥٥) النحل: ١٢٥.

بکاتەوە لە سەر باس کردنی شتە ئیجابی و باشەکان و کردەوەی چاك، هەروەها باس کردنی شتە نێگەتیف و خراپەکان و دورکەوتنەوە لێیان، هەروەها خاوەنی چەکی قسە کردن بێ بۆ ئەوەی بتوانێ بە شێوەیەکی ئاشتیانەو ڕاست و دروستی خۆی زاڵ بکا بە سەر بەرامبەرەکەی.

٤. ڕەخساندنی ژینگەیەکی چاك بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی بگات، دور بێ لە هەڵەو پەڵەو کاری خەراپ و نابەجێ کە بەڵگە بداتە دەستی بەرامبەرەکەیەوەو لە ئەنجامدا شەڕی ڕاگەیاندن و لەکەدار کردنی ئەموونەو دروست بێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾[٥٦]، واتە بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زیناو تاوان لە ناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بلاو ببێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهان بۆیان ئامادەیە، خوا خۆی چاك دەزانێت سەرەنجامی شەرواڵ پیسی بەرەو کوێ دەچێت، ئێوە نایزانن.

٥. فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکا: هەرکردەوەیەك کە مرۆڤ ئەنجامی بدات، ئەشێ کاریگەریەکی هەبێ ئینجا چ ئێستا یا دوایی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾[٥٧]، واتە ئەی پێغەمبەر(د-خ) پێیان بڵێ کاروکردەوە بکەن چونکە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانیش کردەوەکەیان دەبینن. بۆیە وەك گوتمان بەرهەمێکی

(٥٦) النور: ١٩.

(٥٧) التوبة: ١٠٥.

دەبێ ئەگەر باش بێ باشەی لێدەکەوێتەوە، ئەگەر خراپ بێ خراپەی لێدەکەوێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الْأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ ﴾(٥٨)، واتە نمونەی قسەی باش وەکو داری باش وایە بەرهەمی باش پێشکەش دەکا، وە نمونەی قسەی خراپ وەکو داری خراپ وایە بەرهەمی خراپ پێشکەش دەکات، بۆیە پێویستە فەرمان بە چاکە بکرێ و بەرگری لە خراپە بکرێ.

٦. مەبەستێکی ئاشکراو ئامانجێکی ڕوون: ڕونی و ئاشکرا بوونی بیرۆکەکە زۆر جار بانگ خواز و چاکساز لە کۆسپ و تەگەرەکان ڕزگار دەکات و ناهێڵێ گەندەڵ کاران بە سەری دا زاڵ بن و ڕێگەی لێ بگرن. بۆیە تەماشا دەکەی قورئان بە زمانی عەرەبیەو ڕونەو ئاشکرایە. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾(٥٩)، واتە بزانن لە سەر پێغەمبەرەکەمانە بە ڕوون و ئاشکرایی پەیامەکەی بگەیەنێ.

٧. بەکار هێنانی هەموو تواناو هێزو هۆکارەکان بۆ ڕیشەکێش کردنی گەندەڵی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ

(٥٨) ابراهيم: ٢٤-٢٦.

(٥٩) المائدة: ٩٢.

رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ ﴾(٦٠)، واتە خوا فەرمان دەدات بە کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلام هەرچی لە تواناتان دا هەیە بۆ بە هێز کردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕو ئامادەی بکەن (هێزی ئاسمانی دەریایی وشکانی) لە ئامادە کردنی هەموو جۆرە ئەسپ و هۆکانی تری گواستنەوە، کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن، چونکە تۆ کاتێ بە سادەو بێ هێزی چویە مەیدانەوە بە دڵنیاییەوە دەیدۆڕێنی. لە بەر ئەوە کەسی چاکساز دەبێ بە چەکی هێزو بازو غیرەت و ئازایەتیەوە بچێتە مەیدان، وە هێزوتواناکەشی ئاشکرا بێ کە ترس و دڵە ڕاوکێ بخاتە دڵی بەرامبەرەکەیەوە.

٨. نابێ شوێن گەندەڵ کاران بکەون و گوێ ڕایەڵیان بکەن: ئەوە کێشەیەکە زۆر جار ئەوانەی هوتافی چاکسازی لێدەدەن زۆر جار خۆیان بەژدار بوون لە گەڵ گەندەڵ کاران. ڕەنگە لە چۆنیەتی گەندەڵیەکە بەژدار نەبووبن، بەڵام بە گشتی لە سیستەمەکە ئامادە بوون کە گەندەڵی تیا کراوە. ئەوەش زیاتر لە هۆکارێکی هەیە کە هەوڵیان داوە خۆیان و خەڵکیش قەناعەت پێ بکەن بە ڕاست و دروست بوونی ئەو کارەی کردویانە، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾(٦١)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ

---

(٦٠) الانفال: ٦٠.

(٦١) هود: ١١٣.

﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ﴾(٦٢)، واتە ئەی محمد هەواڵی ئەو کەسانەیان بە سەردا بخوێنەوە کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێ بە خشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دورە پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایە پێش و چووە ڕیزی سەر لێشێواوانەوە، وەکاتێ موسا ئامۆژگاری هارونی برای دەکا دەفەرموێ:﴿وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾(٦٣)، واتە تۆ لە باتی من دەوری چاکسازی ببینەو نەکەیت شوێن ڕێبازی ئەوانە بکەویت کە چێنەری تۆوی خراپەن.

٩. قەناعەت و ئارامی و جێگیر بوون لە سەر کارەکە: چونکە کەسێك بە کارێکی ئاوا هەڵبسێ بێ گومان کۆسپ و تەگەرەی زۆری بۆ دێتە ڕێگا، بۆیە دەبێ ئارام بگرێ و بە سۆزەوە کار نەکات چونکە دوایی سەرکەوتوو نابێ، بۆیە ئەگەر ئارامی گرت و بەردەوام بوو تا بۆ خەڵك ڕۆن دەبێتەوە کە ئەو لە سەر حەق و ڕاستیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ﴾(٦٤).

١٠. یەکخستنی هەوڵەکان: چونکە بە یەك دەست چەپڵە لێ نادرێ و بە پەرت و بڵاوی ناگاتە ئامانجەکانی، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ

(٦٢) الاعراف: ١٧٥.

(٦٣) الاعراف: ١٤٢.

(٦٤) فصلت: ٥٣.

جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا ﴾[٦٥]، هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾[٦٦].

**١١. گرنگی دان بە بلاو کردنەوەی زانست و رۆشنبیری:** نەزانی باروتێکە بۆ گەشە کردنی گەندەڵی، لە بەر ئەوە هەرکاتێ ئاستی رۆشنبیری و زانست و مەعریفە بەرز بویەوە ئەوە هۆکارەکانی گەندەڵی لاواز و بێ هێز دەبێ و لە ناو دەچێ، وە کەسێك لە خوا دەترسێ و سنوری خو نابەزێنێ کە خاوەنی زانست و رۆشنبیریە. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ ﴾[٦٧]، واتە هەر زانایانن لە خوای گەورە دەترسن، لای کەمی پێغەمبەرەکەمان هاتووە فێرمان بکات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾[٦٨].

**١٢. خۆڕاگری:** کێشەکان لە ناو کۆمەڵگادا زۆرن بۆ ئەوەی لە تاقی کردنەوەکاندا سەرکەوتوو بێ دەبێ ئەو مرۆڤانەی بانگەشەی چاکسازی دەکەن خۆڕاگربن تا وەکو پاك و پیس لێك جودا دەکرێتەوە، چونکە زۆر جار لە لایەن

---

(٦٥) آل عمران: ١٠٣.

(٦٦) الانفال: ٤٨.

(٦٧) فاطر: ٢٨.

(٦٨) الجمعة: ٢.

**بەشێك لە كۆمەڵگاوە نەفرەتیان لێ دەكرێ و لەلایەن دەسەڵات و گەندەڵ كارانەوە دژایەتیان دەكرێ، وە موچەیان دەبڕدرێ، فەسل دەكرێن، لە كەسایەتیان دەدرێ و بریندار دەكرێن و بوختانیان بۆ هەڵ دەبەسترێ لە كۆتایشدا هەوڵی كوشتنیان دەدرێ. ئیتر ئەو هەموو ڕێگری و كۆسپ و تەگەرانە لە سەر ڕێگای چاكسازیدان، ئەگەر خۆڕاگری بوونی نەبێ دەبێ واز لە هەوڵەكەیان بۆ چاكسازی بهێنن. ئیتر خۆڕاگری و ئارامی و...هتد، تاڵە بەلاَم بەرهەمەكەی شیرینە. خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾[٦٩]**، واتە ئەی محمد چۆن فەرمانت پێ دراوە هەروا بەڕاستی و بەڕێكی فەرمانەكان بەجێ بهێنە، هەروەها ئەو كەسانەش لە گەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆلای خواو تەوبەیان كردووە، نەكەن لە سنوری فەرمانی خوا دەرچن، چونكە بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بینایە بەو كردەوانەی كە دەیكەن، نەكەن مەیلی دڵتان لە گەڵ ئەوانەدا بێت كە ستەمیان كردووەو لە خوا یاخی بوون، چونكە ئەو كاتە ئاگر دەتانسوتێنێت، كەسیش جگە لە خوا پشتیوانتان نابێت، لەوەو دواش یارمەتی نادرێن.**

---

(٦٩) هود: ١١٣.

# تەوەری دەیەم

# خوێندنەوەیەك بۆ مرۆڤ و قورئان

گومانی تێدا نیە كە پەیوەندیەكی زۆر بەهێز و كاریگەر لە نێوان مرۆڤ و قورئاندا هەیەو دەیسەلمێنێ كە میحوەری قورئان مرۆڤەو بۆ مرۆڤ هاتووە، بۆیە دەپرسین: مرۆڤ چیە؟ قورئان چیە؟ پەیوەندی مرۆڤ بە قورئانەوە چیە؟ سروشتی مرۆڤ وایە كە لە قوڕ و ڕۆح پێك هاتووە، ئەو دوو پێكهاتەیە ئامرازی سەرەكی دروست بوونی مرۆڤن، خوای گەورە لە قورئاندا تیشكی خستۆتە سەر و دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾[70]، خوای گەروە بە فریشتەكان دەفەرموێ: من دەمەوێ بەشەرێك مرۆڤێك لە قوڕ دروست بكەم، جاكاتێك كە دروستم كردو لەو گیان و ڕۆحەی كە من خاوەنی ئەوم، فووم پێدا كردو گیان و ژیانم پێ بەخشی، ئێوەی فریشتە هەمووتان سوژدەی (ڕێزو تەقدیری بەفەرمانی من) بۆ بەرن. كەواتە بنەچەی هەموو مرۆڤایەتی لە قوڕەوە سەرچاوەی گرتوە وەكو پێكهاتەی یەكەم، دواتر خوای گەورە بەشێك لە ڕۆحی خۆی دەكاتە بەری مرۆڤ ئەوەش وەكو پێكهاتەی دووەم و دەرەنجام حەزرەتی ئادەمی لێ دەردەچێ (سەلامی خوای لێبێت) وەكو كەسی یەكەم و دواتر ئەو هەموو مرۆڤە وەكو بنەچەو نەوە لە هەمان ئەو ڕۆحە

(٧٠) ص: ٧١-٧٢.

دروست دەبێت، خوای باڵا دەست ئاماژەی داوە کە دەفەرموێ:﴿ ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَ ﴾[71]، واتە پاش قۆناغەکانی نێو زگی دایك، ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمانهێناوە(کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێکوپێکەو ڕۆحی پێبەخشراوە).

ئەوەش لە پاش کۆمەڵێك قۆناغی لە یەکتر جیاواز کە پێیان دەگوترێ قۆناغەکانی(النطفة، العلقة، المضغة المخلقة وغیر المخلقة)و...هتد، دواتر خوای گەورە فریشتەیەك ڕەوانە دەکات بۆ ئەوەی ئەو بەشە ڕۆحەی خوای بخاتە ناوەوەو دوایینجار ببێ بە مرۆڤێکی جیاواز لەو مرۆڤەی سەرەتا پێکهاتەکەی تەنها قوڕ بوو، وە ئەو دوو پێکهاتەیە تەواوی تایبەتمەندی و پێویستیەکانی بەو مرۆڤە بەخشی، ئیتر ئەو مرۆڤە سروشتیە کە دەرەنجامی دوو پێکهاتەی جیاوازە خوای باڵادەست دەیکاتە جێ نشین لەسەر ئەو زەویە، هەروەکو دەفەرموێ:﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ ﴾[72]، ئەوەی لەو ئایەتە بەدەر دەکەوێ ئەوەیە پێشی ئەوەی ئادەم دروست بێ ئەرك و پیشەی دیاری کرا بوو کە بریتی بوو لە جێ نشینایەتی (خلیفة)، هەروەها شوێنەکەشی دیاری کرا بوو کە بریتی بوو لە زەوی ئەوەش بۆ ئەوەی ئەرکی سەرشانی تیا ئەنجام بدات و ئەمانەتەکەی کەبۆی ڕاسپێردراوە بگەیەنێت، وشەی (الجعل) لە قورئاندا بە گشتی مەبەست لێی ڕێکخستن و ئیدارە کردنی کۆی گشتی ئەو گەردوونەیە. بەو بۆنەیەوە لە سەر جێ نشینایەتی مرۆڤ شتێکم بیرهاتەوە جارێکیان لە گەڵ برادەرێکی شیوعی کە

(٧١) المؤمنون: ١٤.

(٧٢) البقرة: ٣٠.

پۆستێکی باڵای هەبوو گفتوگۆیەکمان کرد لە سەر ئەو جێ نشینایەتیە، ئەو دەیگوت مرۆڤ جێ نشین نیە ئەوە هەندێك کەس و لایەنن خۆیان بە جێ نشین و نوێنەری ئیسلام دەزانن، ئیتر ئەو برادەرە تەنانەت ئایەتی ژمارە ۳۰ سورەتی (البقرة)شی قەبوڵ نەبوو، منیش گوتم جێ نشین واتە هەستان بەو ئەرکەی خوا بۆی دیاری کردوون لە زەویدا نەك بەواتای جێگری خوا، بەڵام ئەوە هەندێ مرۆڤن وەکو ئێوە کە لەو چوار چێوەیە دەرچون و ئەو ڕۆڵە نابین و پێشتان وایە نابێ کەس ئەو ڕۆڵە ببینێ.

وەیەکێك لە ئامانجەکانی ئەو جێ نشینایەتیە پەرستشی خوای گەورەیە﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[73]، بەو پێیە هەموو بوونەوەرێك بۆ جگە لە خۆی دروست کراوە، بۆ نمونە هەندێك شت دروست کراوە بۆ ڕووەکو میوەجاتەکان، ئەو ڕووەکەش بۆ ئاژەڵ دروست کراوە، دواتر کۆی گشتی بوونەوەر لە ئاژەڵەوە بگرە تا ڕووەکو هەرچی لەو گەردوونە هەیە لە ئاسمان و زەوی و ڕۆژ و مانگ و هتد .. هەمووی بۆ مرۆڤ تەسخیر و ئامادەکراوە، مرۆڤیش بۆ پەرستنی خوا دروست کراوە[74]، کە قورئان و گەردوون و ئەوەی لە ناویاندا هاتووە، دواجار بۆ ناساندنی خواو یەکتاپەرستی و دەرکەوتنی گەورەیی خوایە.

---

(۷۳) الذاريات: ٥٦.

(۷٤) بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ ئایەتەکانی هەریەك لەو سورەتانەی لای خوارەوە: (لقمان ۲۰، الجاثية ۱۲، البقرة ۲۹، ابراهيم ۳۳- ۳٤).

لە گەڵ ئەو ڕۆڵە گەورەیەی خوا بەخشیویەتی بە مرۆڤ کە جێ نشینایەتیەو ئامانجەکەشی پەرستشی خوای باڵا دەست و ئاوەدانی و عیمران و بەرپا کردنی شارستانیەتە(العبادة والعمران)، بەلام مرۆڤ ڕۆڵی خۆی لە بیرچۆتەوەو هەنگاوەکانی پێچەوانەی فەلسەفەی بوونیەتی لە سەر ئەو زەویە، هەر بۆیە خوای گەورە مرۆڤی بۆ خۆی دروست کردووەو داوای کردووە ئەو بپەرستن نەکەسی تر. کەواتە مەرکەزیەت لەو گەردوونە تا ئەو ساتە وەختەش بۆ زەویە، وە مەرکەزیەت لە سەر زەوی بۆ مرۆڤە، وە ئەو مرۆڤە خاوەن سروشت و پەیامێکی تایبەتە.

لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە خوای باڵا دەست دەفەرموێ:﴿ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾[٧٥]، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَاءَكُم مِّنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾[٧٦]، واتە لەلاین خواوە ڕوناکیەکی ئاشکراتان بۆ هاتووە، (کە محمد پێغەمبەرمانە)، هاوڕێ لە گەڵ کتێبێکی ڕوونکەرەوەدا(کە قورئانە)، بێگومان خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنموونی ئەو کەسانە دەکات کە شوێن ڕەزامەندی خوا کەوتوون، بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسودەیی، لە تاریکاییەکان دەریاندەهێنێت و ڕزگاریان دەکات

---

(٧٥) الشورى: ٥٢.

(٧٦) المائدة: ١٥-١٦.

و دەیانخاتە ناو ڕووناکیەوە بە فەرمانی خۆی و ڕێنموونیشیان دەکات بۆ سەر ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروستی(دینداری و خواناسیی وچاکە).

لێرەوە دەکرێ ئاماژە بەچەند سروشتێکی قورئان بکەین لە دیدی قورئان خۆیەوە:

یەکەم: قورئان ڕۆحە لە لایەن خواوە، دەکرێ ئەو بۆچوونە نزیك بێت لەو ئایەتەی کە دەفەرموێ:﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾(٧٧)، یەکێك لە تایبەت مەندیەکانی ڕۆح ئەوەیە هەموو پێداویستیەکانی ژیان دەبەخشێتە قەوارەی مرۆڤایەتی، بۆ نمونە کاتێك ڕۆح دەبەخشرێتە مرۆڤ ژیانی پێ دەبەخشێ لە کاتێکدا مردووە، وە کاتێ دەبەخشرێتە کۆمەڵێك مرۆڤ دەبن بە یەك جەستەو یەك میللەت و یەك نەتەوە، ﴿ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾(٧٨).

ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) کە دەفەرموێ:(مثل المؤمنين في توادهم وتعاطفهم وتراحمهم مثل الجسد اذا اشتكى منه شيء تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى)(٧٩)، ئا ئەوە بەرهەم و دەرەنجامی بوونی ڕۆحی قورئانە لە قەوارەی مرۆڤایەتی.

(٧٧) الاسراء: ٨٥.

(٧٨) آل عمران: ١١٠.

(٧٩) رواه البخاري.

دووەم: قورئان بریتیە لە نور: خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾[80]، قورئـان نـورە لـە نـوری خـوا ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[81]، بۆیە ئەگـەر کەسـێك نـور نـەبێت نـاتوانێ نـور ببەخشـێت، وە تایبەتمەندی نوریش ئەوەیە ئاسایش و ئارامی دەبەخشێ، مەودای بینین و بیرۆکەو بۆچوونەکان ڕۆشن و ڕونتر دەکاتەوە، وە شتەکان لە سەر حەقیقەتی خۆی بەدەر دەخات. قورئان نورە بۆ دڵ بۆ چاو بۆ زوبان و هەموو ئەندامەکانی تر، هـەروەها نورە بۆ تاکو خێزان و نەتەوەو مرۆڤایەتی بە گشتی، وەکـاری قورئـان لـە سـەر بنـەمای نـور بـوونی بریتیـە لـە هیدایـەت ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾[82]، بۆیە ڕۆژانە ئەگەر ١٧جار داوای هیدایەت لە خوای گەورە نەکەین تەنانەت نوێژەکانیشمان دروست نابێت کە دەڵێین:﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾[83]، هەر پێنج ئایەتی سەرەتا سورەتی فاتیحە پێشەکیەکن بـۆ ئـەو ئایەتـە، وە هـەموو ئایەتەکانی کە لـە دوای ئەو ئایەتەوە دێن بە درێژی باس کردنی ئەو هیدایەتەیـە، ئەی باشە وەڵامی داوایەکەمان کە دەڵێین ﴿ ٱهْدِنَا ﴾ لە کوێ دەسـەکەوێ؟ بـێ گومـان وەڵامەکـەیمان لـە ئایـەتی دووی سـەرەتای سـورەتی (البقـرة) دەسـت دەکەوێت، وەکو ئەوەی خوای گەورە بڵێ ئێوە داوای هیدایەت دەکەن فەرموون

(٨٠) الشورى: ٥٢.

(٨١) النور: ٣٥.

(٨٢) الاسراء: ٩.

(٨٣) الفاتحة: ٦.

ئەو کیتابە کە قورئانە هیدایەتە دەستی پێوە بگرن کە هیچ گومانی تێدا نیە ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾[٨٤]، کە ئەو سورەتە وەکو پێشەکیەکە بۆ قورئانی پیرۆز.

کەواتە قورئان هیدایەتە بۆ گرۆی مرۆڤایەتی بە مەرجێك شوێنکەوتەی بێت و دەستی پێوە بگرێت، چونکە هیچ شتکێکی خێر نیە قورئان ڕێگاکەیمان پێ نیشان نەدات و هیچ شتێکیی شەڕیش نیە قورئان نەهی لێ نەکردبێ و مرۆڤەکانیشی فێری خۆپاراستن نەکردبێت لێی، کەواتە ﴿ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ﴾[٨٥].

نمونەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و قورئان زۆرەو دەکرێ لەو خالانەی خوارەوە چەند نمونەیەك بخەینە ڕوو:

١.پەیوەندی ڕۆحە بە جەستەوە (ژیان – مردن) ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾[٨٦]، مرۆڤ بە بێ قورئان وەکو مردوو وایەو مرۆڤ بە قورئان زیندوو دەبێتەوە، بەڵام خواردنی ئەو ڕۆحە چیە؟ ئێمە گوتمان مرۆڤ لە دوو پێکهاتەی سەرەکی پێك هاتووە کە قوڕ و ڕۆحە. پێکهاتەی

(٨٤) البقرة: ٢.

(٨٥) البقرة: ١٢٠.

(٨٦) الانعام: ١٢٢.

یەکەم کە قورە ڕۆژانە پێویستی بە سێ جەم خواردن هەیە، بەڵام پێکهاتەی دووەم کە ڕۆحە پێویستی بە خۆراکێك هەیە کە لە ڕەگەزی خۆی بێت. ئەو خۆراکەش بریتیە لە نیگا(الوحي).

کەواتە ئەو پێکهاتەیە ڕۆژانە پێنج جار وزەی پێوستە کە خۆی لە پێنج نوێژەکە دەبینێتەوە، لێرەوە حەقیقەتێکی ترمان بۆ دەرکەوت کە بریتیە لەوەی برسێتی ئاینی زۆر گەورە ترە لە برسێتی جەستەیی کە پێکهاتەکەی قورە.

٢. پەیوەندی نورە بە بینینەوە: هەروەکو دەفەرموێ:﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾(٨٧).

قورئان نورە وە بە نور مرۆڤ دەتوانێ ببینێت، وە پێویستی مرۆڤ بۆ ئەو نورە وەکو پێویستیەتی بە ئاوو هەوا .

٣. پەیوەندی ئاو و زەوی: بۆ ئەو خاڵەشیان تەنها ئاماژە بەیەك فەرموودەی پێغەمبەر دەکەین کە دەفەرموێ: (إن مثل ما بعثني الله به من الهدى والعلم كمثل غيث أصاب أرضاً، فكانت منها طائفة طيبة قبلت الماء فأنبتت الكلأ والعشب الكثير، وكان منها أجادب أمسكت الماء فنفع الله بها الناس فشربوا منها وسقوا ورعوا، وأصاب طائفة منها أخرى إنما هي قيعان لا تمسك ماء ولا تنبت كلأ، فذلك

(٨٧) المائدة: ١٥-١٦.

مثل من فقه في دين الله ونفعه الله بما بعثني الله به فعلم وعلّم، ومثل من لم يرفع بذلك رأساً ولم يقبل هدى الله الذي أرسلت بـه)[88]، ئـەو فەرموودەیـە زۆر بـە ڕوونـی پەیوەندی نێوان قورئان و مرۆڤ دیاری دەکات، کەواتە پەیوەندی یەکەم بریتی بوو لە زیندوو کردنەوە، پەیوەندی دووەم بریتی بوو لـە بەرجەستە کردنـی بیـنین بـۆ مرۆڤەکان، پەیوەندی سێیەم بریتی دەبێت لـە پیتاندن واتە ڕەخسـاندن و فەراهـەم کردن و ڕێخۆش کردن بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ مێژوو شارستانیەتی خۆی دروست بکات. کەواتە وەکو چۆن هیچ زەویەك بە پیت نابێت بەبێ ئاو بەڵکو ژیان نابێت بە بێ ئاو، ئاواش هیچ دڵێك هیدایەت وەرناگرێت بە بێ قورئان.

شێخ محمد حسان دەڵێ: چاوم بە دادوەرێکی خاوەن ئەزموون کەوت، پرسیارم لێ کرد چ ڕووداوێکت هاتۆتە پێش کە شایستە بێت من لـە کتێبەکـەم بینوسـم. دادوەرەکە دەڵێ: ڕۆژێکیان لـە سەر یەکێك لـە شەقامەکان کەسێك کوژرا بوو، لـەو کاتەش یەکێك بەوێدا تێدەپەڕێت، ئیتر دەستگیر دەکرێ و تۆمەتبار دەکـرێ بەوەی کە ئەو بکوژی ئەو کەسەیە، ڕۆژی دادگاییەکەی هات و ئەویش بەرگری لە خۆی دەکرد کە ئەو نەبووەو قەدەری خوا ئەو لـەو کاتە بەوێدا تێپەڕیوە، بەڵام ئەوە دادی نەداو بەپێی یاسا دەبێ حوکمی لـەسێدارەدانی بۆ دەربچێ، وە خەڵك و ئامادەبوانیش هەر چاوەڕێی ئەو حوکمەیان دەکرد، دەڵێ کاتێ گەیشتمە ئـەوەی کـە دەبـێ حوکمـەی بـۆ دەربکـەم و ڕای بگەیـەنم، وەکـاتێ کـە حوکمەکـەم دەخوێندەوە هەستم دەکرد کە تێك دەچووم و هەستم بە شتێکی ناخۆش دەکرد، دەڵێ تا ئەوەی زۆری بۆ هێنام لە بری حوکمەکە دانیشتنی دادگاکەم دواخست بۆ

---

(٨٨) رواه مسلم.

کاتێکی تر، خەڵك چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد و زۆریان پێ ناخۆش بوو، دەڵێ نەگەیشتینەوە دانیشتنی دادگای دواخراو، کەسێکی تر دەستگیر کرا کە تاوانی زۆری ئەنجام دابوو، دانی بەوەدا نا کە ئەو کەسەش ئەو کوشتویەتی، دەڵێ دواجار تۆمەتباری یەکەم بێ تاوان دەرچوو، چومەلای گوتم ئەرێ تۆ چی؟ من کاتێ ویستم حوکمی لە سێدارەدانت بۆ دەر بکەم حاڵەتێکی زۆر خەراپم بەسەر داهات؟ دەڵێ ئەویش گوتی بەخوا من هەموو قورئانم لەبەرەو هەموو شەوێکیش بەردەوام دەیخوێنم، ئەو شەوەی کە بڕیار بوو بۆ سبەینێکەی لە دانیشتنی دواخراو حوکمی لەسێدارەدانم بەسەردا بسەپێنن، زۆر لە خوا پاڕامەوەو گوتم خوایە من هەتا ئێستا ئەو قورئانەی تۆم پاراستوەو دەتۆش من بپارێزە لەو تۆمەتەی ڕووبەڕووم بۆتەوە، دەڵێ بەو شێوەیە تاوانباری سەرەکی دۆزرایەوەو منیش بێ تاوان دەرچووم.

# تەوەری یازدەهەم

# عەقڵی مرۆڤ و نیگای خوا تەواوکەری یەکترین

ئاینی ئیسلام کۆتا ئاینی ئاسمانیەو بۆ گشت خەڵکی سەر ئەو زەویە هاتووە، مەنهەج و دەستور و ڕێبازێکی خواییەو دایناوە بۆ ئەوەی تێکرای گرۆی ئادەمی لە سەر ئەو مەنهەج و پرۆگرامە بڕۆن و دەستی پێوە بگرن.

لەو بابەتە تیشك دەخەینە سەر عەقڵی مرۆڤ و وەحی خودا کە ئایا هەریەك لەو دوانە تەواو کەری ئەوی تریانەو هەردوکیان پێکەوە جوانن یا خود تەنها وەحیەو لە بەرامبەردا عەقڵ هیچ پێگەو پلەو پایەیەکی نیە؟

ئیسلام پرۆگرامێکی خواییە بۆ مرۆڤەکانی داناوەو پێویستە لە سەر مرۆڤەکان بە گوێرەی هەمان ئەو یاساو ڕێسایانەیە هەنگاو بنێن و دەست بەو پەتە خواییەوە بگرن، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە کە ئەو وەحیە دیپۆرتی ڕۆڵی مرۆڤی کردبێ و هیچ مەجالێکی بۆ عەقڵی مرۆڤەکان نەهێشتبێتەوە لە بەرامبەر ئەو مەنهەج و ڕێبازە کە وەحیە. هەروەها واتای ئەوە نیە کە بە ڕەهایی حوکمی نێگەتیڤ و نەرێنی بە سەر عەقڵ و ژیری مرۆڤەکان دا سەپاندبێت وەکو هەندێك توێژی کۆمەڵگا وای تێگەیشتوون و پێیان وایە عەقڵ لە بەرامبەر ئەو مەنهەجە خواییە تەنها لایەنی جێبەجێ کارەو نابێ بڵێ ئەوە بۆ؟ ئەوەیان بۆ چی؟ ئاخر چۆن؟ یان ئەگەر وەحی قسەی خۆی کرد و عەقڵیش تەنها کاری ملکەچ و تەسلیم بوون

بوو ئەوە واقیعێکی ناتەندروست دەردەچێت، چونکە خوای باڵا دەست ڕۆڵی مرۆڤ و کاریگەری و چالاکیەکانی لەو گەردوونەدا هەڵنەوەشاندۆتەوەو بەڵکو وەکو مامۆستا ناصری سوبحانی دەڵێ خوای گەورە لە ڕێگەی مرۆڤەکانەوە قسە دەکات و پەیامەکەی دەگەیەنێت، واتە کاتێ مرۆڤ قسە دەکات ئەوە مرۆڤ نیە بەڵکو خوایە قسە دەکات لە ڕێگەی مرۆڤەکانەوە، کەواتە خوا نەك هەر ڕۆڵی مرۆڤ و عەقڵە ئەرێنی و ئیجابیەکەی لە تێگەیشتنی وەحی هەڵنەوەشاندۆتەوە، بەڵکو جەختی لە سەر گرنگی و کاریگەریەکەی کردۆتەوە، وە زۆر بە پەسەند و ڕەسەن و بەهادار وەسفی کردوەو ئەو شەرەفە گەورەی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی شەرح و شرۆڤەو شیکاری بۆ نیگای خودا بکات و وەکو سەرچاوەیەکی مەعریفی مامەڵەی لە گەڵ بکات، چونکە عەقڵی مرۆڤ بە دوای مەعریفەتدا دەگەڕێت و موکەلەفە بەوەی سەرچاوەکانی ئەو مەعریفەتە بدۆزێتەوە، چونکە ئێمەی موسڵمان بۆ زانین و گەڕان بە دوای زانستی مەعریفی پشت بە دوو سەرچاوە دەبەستین:

یەکەم: ئەو وەحی و نیگایە کە بریتیە لە قورئان (أيات تنزيلية في كتاب الله المقروء) یان بە کورتی (كتاب مسطور)، ئەو وەحیە پێی دەگوترێ سەرچاوەی مەعریفەی شەرعی (مصادر المعرفة الشرعية).

دووەم: ئەو گەردوونە بینراوە فراوانەیە کە بەچاو دەیبینین و گەرەکە گەورەیی خوای تیا ببینینەوە(أيات كونية في صفحة الكون المنظور) یان بە کورتی(كتاب منظور)، ئەوەیان پێی دەگوترێ سەرچاوەی مەعریفەی سروشتی (مصادر المعرفة الطبيعية).

خوای گەورە فەرمانی پێکردووین بیر بکەینەوە لە بەڵگەو ئایەتەکانی وەحی وگەردوونیەکان وەکو دوو سەرچاوەی مەعریفی و ئامرازی ئەو دوو سەرچاوەیەش بریتیە لە عەقڵ و هەستەوەرەکان(العقل والحس). خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ﴾(٨٩).

خوای گەورە هەموو شتێکی لە قورئان باس نەکردووە ئەوەش لای کەمی دوو هۆکاری هەیە یەکەمیان ئەگەر هەموو شتێکی باس بکردایە ڕەنگە ئەو قورئانە کۆن ببوایەو ئەو گەرم و گوڕیەی هەیەتی ئەو کات نەیبوایە. دووەمیان بۆ ئەوەی مەجالی عەقڵی مرۆڤەکان بدات. بۆیە کاری عەقڵ پڕکردنەوەی ئەو فەراغە تەشریعیەیە کە وەحی خوایی لێی بێ دەنگ بووە.کەواتە هیچ کات وەحی کۆسپی بۆ عەقڵ دروست نەکردووە تا نەتوانێ داهێنان بکات و گرنگی بوونی خۆی بسەلمێنێ.

نیگای خوایی زۆر شتی بۆ عەقڵ جێ هێشتوە لەوانە:

یەکەم: لە بواری عەقیدەو بیروباوەڕ بۆ ئەوەی بگاتە دوو حەقیقەتی سەرەکی لەو بوونەوەرەدا:

(٨٩) النحل: ٧٨.

١.بوونی خواو یەکتاپەرستیەکەیەتی، کـە پێویسـتی بـە ڕوانینێکـی ڕاسـت و عەقڵێکی ئەکتیف هەیـە، هـەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێ:﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[٩٠][٩١].

٢. جێگیری نیگاو پەیام و پێغەمبەرایەتی، ئەوە عەقڵە ڕوودانی دابەزینی وەحی و هاتنی پەیامی ئاسمانی و بوونی محمد (درودی خوای لێبێت) بە پێغەمبەر لە لایەن خواوە دەسەلمێنێ، ئیتر لەو بوارە عەقڵ دادوەرە، هەر بۆیە زانایان دەفەرموون عەقڵ بنەمای نەقڵە، بە عەقڵ هەموو ئەو موعجیزانەی لە سەر دەستی پێغەمبەر هـاتووە جیا دەکرێتەوە لە سیحر و جادو گەری کە لەسـەر دەسـتی سـاحیرەکان ئـەنجام دەدرێت.

<u>دووەم:</u> لە بواری تەشریع مەجالی بە عەقڵ داوە کاری خۆی بکات کە بریتیە لە قیاس و ئەسل و فەرع و...هتد کە بوار نیە بە درێژی باسی بکەین.

<u>سێیەم:</u> لە مەیدانی ئەخلاق مەجالی عەقڵ زۆرە کە خۆی دەبینێتەوە لە لێـك جودا کردنەوەی حەڵاڵ لە حەرام و بە پێچەوانەوە، هەروەها خێرو شەڕو...هتد.

<u>چوارەم:</u> وەحی مەجالی بۆ عەقڵ هێشتۆتەوە کە لە بواری گەردوونی کـاری خۆی بکات و بـەرەو ئاسمـان و دابـەزین بـۆ سـەر زەوی و ڕامـان لــە دەرون و پـــەروەردە کردنـــی، هـــەروەك دەفـــەرموێ: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ

---

(٩٠) آل عمران: ١٩٠.

(٩١) هەروەها بگەڕێوە بۆ ئایەتەکانی: (الطور ٣٥-٣٦، الانبیاء ٢٢ – ٢٤، المؤمنون ٩١).

وَٱلۡأَرۡضِ﴾[92]، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾[93].

**<u>پێنجەم:</u> مەجالی عەقڵ لە بواری داهێنانی دونیای و دروست کردنی ئامرازەکانی ژیان و گوزەران و...هتد. وەکو دەفەرموێ: (أنتم اعلم بأمور دنياكم). لە قورئانیشدا هاتووە: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾[94].**

**<u>شەشەم:</u> مەجالی عەقڵ دراوە سود لە تەجاروب و ئەزمونی خەڵکی تر وەربگرێت، هەروەها سود لە کەلتوری پێشینەکان وەربگرێت، دەفەرموێ: ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾[95]، هەروەها دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾[96]، هەروەها پێغەمبەر دەفەرموێ: (الحكمة ضالة المؤمن، أنى وجدها فهو أحق بها)[97].**

(٩٢) يونس: ١٠١.

(٩٣) الذاريات: ٢٠-٢١.

(٩٤) القصص: ٧٧.

(٩٥) الحشر: ٢.

(٩٦) الحج: ٤٦.

(٩٧) رواه الترمذي وابن ماجة.

# تەوەری دوازدەهەم

# ئیختلاف سونەتی ژیانە

ئیختلاف ئەو سونەتە خواییەی کە بەلای هەندێکەوە ڕەحمەتەو لە لای هەندێکی تریش نیقمەت. بە جۆرێك بێ سەروبەری لە نێوان ئەهلی عیلم و زانست دروست دەبێت بە بێ ڕەچاو کردنی ئاداب و یاسا گشتیەکانی ئیختلاف و جیاوازی لە هزر و بیردا، وە ئەو ئیختلافە زۆر جار لە چوار چێوەی جیاوازی لە بیروبۆچوونەکان دەردەچێ و دەبێتە کێشە لە نێوان هەردوو کەسەکە، واتە لە بری ئەوەی لە سەر جیاوازیەکان ڕێك بکەون و لە سەر ڕێکەوتنەکانیش بەشداری و یارمەتی یەکتری بدەن بە داخەوە دەبێتە کێشەو جیاوازیەك پڕ لە ڕق و کینەو دژایەتی و دوژمنایەتی، ئەوەش نەزانی و ناڕۆشنبیری ئەو کەسانە دەردەخات کە ئاوا بیر دەکەنەوەو تەنها بۆچوونی خۆیان قەبوڵەو هیچی تر، هیچ نەبێ دەبێ بڵێی (الرأي والرأي الاخر)، یاخود لای کەمی (هذا رأي يحتمل الخطأ، ورأي غيري يحتمل الصواب).

لە بنەڕەتدا ئیختیلاف و جیاوازی دەبێ لە عەقڵ و فیکردا بێت، بەڵام لە کۆمەڵگای موسڵمانانی ئێستا دابەزیوە بۆ ناو دڵ و دەروون و لە ئەنجامدا بووە بە ڕق و کینەو ئێرەیی، خوای گەورە هەر لە سەرەتاوە ئەو گەردوونەی بەجیاوازی دروست کردووە، ئاسمان جیاوازە لە گەڵ زەوی، شەو جیاوازە لە گەڵ ڕۆژ، وەرزەکانی ساڵ جیاوازن لە یەکتری و...هتد.

لەو کورتە باسەدا بە پشتیوانی خوا تیشك دەخەینە سەر ئیختلاف و ئومێدەکەین زانایان و ئەهلی عیلم و مەعریفەت یان جوانتر بڵێین خۆشەویستانی زانست و مەعریفەت بتوانن سود و قازانجی لێ وەربگرن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾(٩٨)، واتە خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بە یەك تاقم و دەستەو کۆمەڵ بەڵام بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لە نێوانی یەکتردا لە ئاین و بەرنامەو بۆچووندا، مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتیەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش خوای گەورە دروستی کردوون، (واتە بەشێوەیەك دروستی کردوون کە بتوانن ئازادی بیروباوەڕو بۆچوونیان هەبێت، ئینجا ڕێگەی ڕاستیان پێ بڵێت و بۆیان ڕوون بکاتەوە.

وتەیەك هەیە زۆرجار ئاماژەی پێ دەکرا کە گوایە جیاوازی ئومەت ڕەحمەت بێت، من باسی ڕاست و ناڕاستی ئەو وتەیە ناکەم، بەڵام گومانم نیە لەوەی ئەگەر ئیختیلاف و جیاوازی لە چوارچێوەی فیکرو عەقڵدا بێت و بمێنێتەوە دەبێتە مایەی ڕەحمەت و بەزەیی خواو هەروەها پێشکەوتن و بەرپا کردنی شارستانیەت، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو ئیختیلاف و جیاوازیە دابەزیە ناو دڵ بێگومان شوێنی ئیمان و باوەڕ دەگرێتەوەو دواجار ئەو ڕەحمەتە لەدەست دەچێت و ئەو جیاوازیە دوای ئەوەی دەبێتە ڕق و کینەو ئیرەیی و سەردەکێشێ بۆ لێکترازانی گەورەو دەبێتە هۆکاری پاشەکشەو دواکەوتن.

---

(٩٨) هود: ١١٨-١١٩.

جیاوازی هەمووی شەڕ نیە، بەڵکو ئەوەی شەڕە دەکرێ شەڕەکەی کەم بکرێتەوە، چونکە لە باشترین جیل کە جیلی هاوەڵان و شوێنکەوتوانیانە ئەو جیاوازیە هەبووە. بەڵام هەرگیز نەبووە بە مایەی ئەوەی دڵەکان لێك جودا بکاتەوە. ئەو جیاوازیە هۆکاری خۆی هەیە هەندێکی پەیوەندی سروشتی مرۆڤەکە خۆیەتی، هەندێکی تر ژینگەو واقیعی دەوروبەری وای کردووە مرۆڤ هەمیشە جیاوازی هەبێ، هەندێکی تریش دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتە زانستیەکەی مرۆڤ خۆی.

خوای باڵا دەست ئیختلاف و جیاوازی کردووە بە بەشێك لە سروشتی ئەو ژیان و ژینگەیە، جاری وا هەیە کوڕ لە گەڵ باوك جیاوازی هەیە لە هزر و بیر و دەرون و ڕەنگ و هەتا دوایی.

بەڵام ئەو سونەتە خواییە مرۆڤەکان زۆر تەسکیان کردۆتەوەو هەندێ جار پرسیاریش دەکرێ ئایا تا کەی ئەو جیاوازیە لە نێوان زانایان بەردەوام دەبێت؟ تاکەی ئەو ئیختلافە لە نێوان موسڵمانان بەردەوام دەبێت؟ بۆ ڕێك ناکەون؟ بەڵام لە وەڵامدا دەبێ دڵنیا بن تا ئەو زەویە بوونی هەبێ و خەڵك لە سەری بژین ئەوە ئیختلافیش هەر بەردەوام دەبێت، بۆیە هیچ کات خەون بەوە نەبینن بڵێن لەمەولا موسڵمانان ڕێك دەکەون. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾[٩٩]، کەواتە ئیختلاف لە واقیعدا هەیە، لە ڕووی شەرعیشەوە هەندێکی باشەو هەندێکی خەراپ، کە پێشتر

(٩٩) البقرة: ٨٩.

ئاماژەمان پێ کرد، بەڵام مرۆڤەکان ئامرازی ئاراستە کردنی جیاوازیەکانن بەرەو باشە یان خەراپە.

ئەگەر تۆ پێت وایە زانستی زۆر و دینداری هۆکاری لاچون و نەمانی ئیختلافە، ئەوە بۆچوونەکەت ڕاست نیە، چونکە ئێستا زانا ترین و تێگەیشتوو ترین خەڵك لە قورئان و سونەت و دڵسۆز ترین و دوورترین خەڵك لە هەواو ئارەزوو، کە ئیختلاف و جیاوازی لە نێوانیان ڕوویداوە، ئا ئەوانەش زانایانی پێش ئێمە نین بەڵکو هاوەڵانی پێغەمبەرن (درودی خوای لە سەر بێت).

لەو ئەڵقەیە ئاشناتان دەکەین بە چەند نمونەیەکی ئیختلاف لە ناو هاوەڵاندا:

نمونەی یەکەم: ئەو جیاوازیەی لە نێوان پشتیوانان (الانصار) هەبوو، کە خوای گەورە ئاماژەی پێ داوە﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾[١٠٠]، ئەو وشەی(اقتتلوا) مەبەستی شەڕە چەپۆك و پێکداداني دەستیە کە لە نێوان پشتیوانان هەبوو، ئەو ئیختلافەش شوێنەواری هەمان ئەو ئیختلاف و جیاوازیە بوو کە لە چەرخی نەفامیدا لە نێوان ئەوس و خەزرەج هەبوو. لە ڕاستیدا ئەو جۆرە جیاوازیە زیاتر کەلتوریەو پێویستە زانایان و ڕۆشنبیران ئاریشە بە ئیختیلاف و جیاوازیەك دروست نەکەن کە بووە بە کەلتورو بۆماوەو لەو سۆنگەیەوە دەبێ خاڵی هاوبەش بدۆزنەوە.

(١٠٠) الحجرات: ٩.

نمونەی دووەم: ئەو خیلافـەی لـە نێـوان نـەوەکانی عـەمری کـوڕی عـەوف ڕوویداو پێغەمبەر (درودی خـوای لێبێـت) چـوو بـۆ کـۆنترۆڵ کردنـی و ڕێـك خستنەوەیان تا وای لێهات لە نوێژی عەسر دواکەوت و ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد. ئەو ئیختیلاف و جیاوازیە نەرێنیەو دەبـێ ڕێگەی لێ بگیرێت، بەتایبەت کە بەرەو ئاراستەی نانەوەی فیتنەو ئاژاوە ڕۆیشت و پێویستە نەهێڵدرێت تەشەنە بکات، بەڵام ئەگەر بەئاراستەیەکی ئیجابی و ئەرێنی شکایەوە، لەدواجاردا لێکەوتەی باشی دەبێت.

نمونەی سێیەم: کاتێ پێغەمبـەر فـەرمووی (لا يصـلين أحـد العصـر الا في بـني قريظة)، هەندێك لـە هاوەڵان واتێگەیشتن کە مەبەستی پێغەمبەر هاندانە لـە سـەر ڕۆیشتن و بەردەوام بوون بۆیە لە ڕێگا نوێژیان کرد. هەندێکی تـر لـە هـاوەڵان زاهیری فەرموودەکەیان وەرگرت بۆیە کە گەیشتنە بەنی قورەیزە ئینجـا نوێـژیان کرد، پێغەمبەریش دانی بەهەردوو نوێژەکە دا هێناو هیچیانی ڕەت نەکردەوە. ئەوە نمونـەی ئیختـیلاف و جیـاوازی ئـەرێنی و ئیجابیـەو هۆکـاری پێشـکەوتن و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری فیکری کۆمەڵگایە.

نمونەی چوارەم: ئەو خیلافەی لە نێوان هاوەڵان ڕوویدا کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) وەفاتی کرد، کێشەیەك لەنێوانیان دروست بوو کە ئایا کـێ ببێتـە جێنشینی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت)، پشتیوانەکان سەعدی کوڕی عوبادەیان دەست نیشان کرد بۆ جێ نشینی لـە پـاش ئـەوەی لـە سـەقیفەی بـەنی سـاعدە کۆبوونەوە، لە پاشان ڕێك کەوتن لە سەر ئەوەی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ببێتە جێنشینی پێغەمبەر (درودی خـوای لێبێـت). بـە قەناعـەتی مـن ئـەو جـۆرە

ئیختیلاف و جیاوازیە لـە ئەنجامدا بۆ کەشف کـردن و دۆزینـەوەی کەسـایەتی و کەسی بە تواناو ئەکتیف و لێهاتووەو هەر بۆیە شیاوترین کەس بـۆ جێنشـینایەتی پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت)، دوای ئیختیلافێکی زۆر لـە کەسایەتی ئەبو بەکردا دۆزرایەوە، لـە ڕاستیدا ئەوە لۆژیکی ئیختیلاف و جیاوازی ڕاستەقینەیە.

نمونەی پێنجەم: ئیختلافی هاوەڵان لـە سەر شەڕی هەڵگەڕاوەکان کە ئایا شەڕ لـە گەڵ هەموو هەڵگەڕاوەکان بکرێت یاخود تەنها لـە گەڵ ئەوانەی باوەڕیان بـە پێغەمبەر نەماوەو زەکات نادەن؟ ئیتر ئەبو بەکر ئەو فەرموودەی بیرهێنانەوە کاتێ پێغەمبەر فەرمووی (أمرت ان اقاتل الناس)، بۆیە هاوەڵان بینیان ئەبوبەکر سورە لـە سەر ئەوەی شەڕ لـە گەڵ هەر کەسێك بکات کە جیـاوازی بخاتـە نێـوان نوێـژ و زەکات، ئیتر تێگەیشتن کە ئەوەی ئەبو بەکر دەیڵێ زۆر تەواوەو هەمویان کـۆك بوون لـە سەر بۆچوونەکەی لـە سـەروی هەمویانـەوە عومـەری کـوڕی خـەتاب (ڕەزای خوا لـە هەمویان بێت). سەیر کە لەو بابەتە ئەبوبەکر پابەنـد نابێـت بـە بڕیاری ئەهلی شوراو بۆچوونی خۆی بەباشـتر دەزانێت.کەواتـە ئیخـتلاف هـەر بەردەوامە بەڵام دەکرێ کەم بکرێتەوە یاخود ڕێك بخرێت. ئیتر وەکو دەڵێ: (لـو سکت من لا یعلم لسقط الخلاف)، واتە ئەگەر ئەوەی شت نازانێت بێ دەنگ بێت ئەوە ئیختلافیش ڕوو نادات، بۆیە ئەگەر تەماشا بکەین زۆر جار مرۆڤەکان تـەنها شتێکیان گوێ لێ دەبێت و خۆیان لێ دەگۆڕێ و ڕوو بە ڕووی زانایان دەبنەوە، بەڵام لـە بنەڕەتدا هیچ نازانن.جارێکیان گەنجێك هاتە لای پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەو گەنجە ناوی ئەبو جەعفەر بوو، لـە لای پێشـەوا ئەحمـەد دانیشـت و گوتی ئایا دەتوانم بە ئاوی گوڵ دەست نوێژ هەڵ بگرم؟ پێشەوا ئەحمەد پێم خـۆش

نیە، گەنجەکە گوتی ئایا دەتوانم بە ئاوی پاقلە دەست نوێژ بگرم؟ پێشەوا گوتی پێم خۆش نیە، گەنجەکە هەستاو ویستی بڕوات، پێشەوا ئەحمەد کراسەکەی گـرت و پێی گوت: کاتێ بچیە ناو مزگەوت چی دەڵێی؟ گەنجەکە بێ دەنگ بوو، پێشەوا گوتی ئەی ئەگەر لـە مزگەوت هاتیە دەرەوە چی دەڵێی؟ گەنجەکە بێ دەنگ بوو، واتە نەیزانی، پێشەوا فەرمووی بڕۆ خۆت فێری ئەوانە بکەو بەشق لاوەکی و بێ سود سەرقاڵ مەکە! ئیتر پێشەوا ئەحمەد زۆر بە جوانی توانی گەنجەکە تێ بگەیەنێ چونکە بابەتەکە بابەتێکی خیلافیە، بۆیە جیاوازی هەیە لـە نێوان شتێك کە شەرعەو ناکرێ پێچەوانەی بکرێ و شتێکیش کە بۆچوونی زانایانـەو ئەگـەری ڕاسـت و هەڵەی هەیە، بۆیە پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێ:(کلامنا هذا رأي، فمن جاءنا بخير منه ترکنا ماعندنا الی ماعنده)، واتە ئەو قسـەی ئێمـە بۆچـوونەو هەرکەسـێك لـەوە باشتری هێنـا ئێمـە بۆچـوونەکەی خۆمـان وەلا دەنـێین و بۆچـوونەکەی ئـەوان وەردەگرین.

# کۆتـایی

بە بڕوای من چالاك كردنی هزری مرۆڤ دەبێ لە ئەولەویاتی پلانی مرۆڤەكان بێت دواجار بۆ ئەوەی كۆمەڵگایەكی هۆشیار و ئاگادار دروست ببێت و مرۆڤـی موسڵمان هەست بە بوونی خۆی بكات، هەروەها شـوێنی هـەبێت لــە ڕستـەدا. پەرتوكی (بەرەو هۆشیاری هزری مرۆڤی موسـڵمان) ڕەنگـە دەروازەیـەك یـاخود هەنگاوێكی سەرەتایی بێت بۆ وێنا كردنی داهاتووی هەر مرۆڤێكی موسڵمان.

لە خوای گـەورە داواكـارم جێگـای ڕەزامەنـدی ئـەو بێـت و لــە پێوانـەی چاكەكانما هەژماری بكات. ئومێدەكەم توانیبێتم كەموزۆر بۆچـوونی خـۆم پـاش خوێندنەوەیەكی زۆر دەربڕم وكەلێنێك لە كتێبخانەی كوردی پڕ بكەمەوە.

هیـوادارم جێگـای ڕەزامەنـدی گـەنج و لاوە خـوێن گەرمـەكانمان بێـت و بەخوێندنەوەی سودێكی باش وەربگرن.

داوای لێبوردن لە خوای مەزن دەكەم لە هـەر كەموكوڕیـەك كـە پـەیم پـێ نەبردبێ.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# سەرچاوەکان

پاش قورئانی پیرۆز:

١. الأحكام السلطانية، أبو الحسن علي بن محمد بن محمد بن حبيب البصري البغدادي، الشهير بالماوردي (ت٤٥٠هـ)، دار الحديث – القاهرة).
٢. أزمة الوعي الديني، فهمي هويدي،(ط١، دارالحكمة اليمانية ،١٤٠٨هـ – ١٩٨٨م).
٣. امبراطورية القرن الامريكي والمجتمع المدني، أحمد ريس وأحمد منير محمد، (دار الرضوان، حلب، ٢٠٠٥م).
٤. البحث عن الحقيقة بين الفلسفة والدين، أحمد خليل سيف، (ط١، ٢٠٠٧م).
٥. تەفسیری ئاسان، برهان محمد أمين، چاپی ٢٥، ٢٠١٣ز.
٦. تجديد الفكر الاسلامي، د.محسن عبدالحميد، (ط١، المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ١٤١٦هـ- ١٩٩٦).
٧. الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه = صحيح البخاري، محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، المحقق: محمد زهير بن ناصر الناصر، (دار طوق النجاة (مصورة عن السلطانية بإضافة ترقيم ترقيم محمد فؤاد عبد الباقي)، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ).
٨. ديوان المبتدأ والخبر في تاريخ العرب والبربر ومن عاصرهم من ذوي الشأن الأكبر، عبد الرحمن بن محمد بن محمد، ابن خلدون أبو زيد، ولي الدين الحضرمي الإشبيلي (ت٨٠٨هـ)، المحقق: خليل شحادة، (دار الفكر، بيروت، ط:الثانية، ١٤٠٨هـ-١٩٨٨م).

٩. عقل الانسان في الفلسفة والطب والقرآن، د.أسعد السحمراني ود.أحمد كنعان، (ط١، دار النفائس، ١٤٢٣هـ - ٢٠٠٢م ).
١٠. الفكر الاسلامي، د.محسن عبدالحميد، (ط١، مكتبة دار الانبار، ١٤٠٨هـ ١٩٨٧).
١١. المذهبية الاسلامية، والتغيير الحضاري، د.محسن عبدالحميد، (ط٤، العراق، ١٤٢٠هـ).
١٢. المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم، مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري (ت٢٦١هـ)، المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، (دار إحياء التراث العربي – بيروت).
١٣. ولايزالون مختلفين، د.سلمان بن فهدالعودة، (الاسلام اليوم، ١٤٢٩هـ).

وتار و پێگە ئەلیکترۆنیەکان:

أ. خطبة الجمعة بمسجد الكوثر بالقاهرة، د.صلاح سلطان.
ب. قواعد الادارة والابداع، د.محمد بن علي شيبان العامري، المنتدى العربي لادارة الموارد البشرية.
ت. شبكة النبأ المعلوماتية.
ث. الحوار المتمدن.

# نـــــاوەڕۆك